دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
شەقامی گوڵان - هەولێر
هەرێمی کوردستانی عێراق
هەگبەی ئەلیکترۆنی aras@araspress.com
وارگەی ئینتەرنێت www.araspublishers.com
تەلەفۆن: 35 49 224 66 (0) 00964
دەزگای ئاراس لە ٢٨ تشرین (٢) ١٩٩٨ هاتووەتە دامەزران

فەرهاد پیرباڵ
هوتێل ئەوروپا - ڕۆمان
کتێبی ئاراس ژمارە: ١٠٤٥
چاپی یەکەم ٢٠١٠
تیرێژ: ١٠٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس - هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ٢٣٠٣ - ٢٠١٠
نەخشاندنی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
ڕازاندنەوەی بەرگ: مریەم موتەقییان
ڕێنووسی یەکگرتوو: بەدران ئەحمەد حەبیب

## پەناهەندە هەر پەناهەندەیە

### ئەگەر وەزیر بێ، ئەگەر مەلا، ئەگەر نیگارکێش

محەمەدی حاجی زادە، مەلایەکی خەڵکی تاران، تەمەن دەوروبەری چل و پێنج ساڵ، هاتبووە پاریس داوای مافی پەناهەندەیی بکا.

بالابەرزێکی چاو هەنگوینی، موو قاوەیی، هەمیشە چوست و چالاک؛ کەچی (حەیف) لەوەتەی من دەمناسی، لە پاریس، بێ ئیش و بێکار دەسووڕایەوە و بەدووای کارێک دەگەڕا. لە سۆنگەی ئەوەی کە هێشتا مافی نیشتەجێبوونی لەلایەن پۆلیسەوە پێ نەدرابوو، هیچ هوتێلێک، سووپەرمارکێتێک.. ئەسڵەن هیچ کافتیریایەکیش مۆڵەتی کارکردنی پێ نەدەدا. هەر کاتێ بمدیبایە، یەکەمین پرسیارم:

– ئاغای محەمەد.. مافی پەناهەندەییەکەت هەر بۆ دەرنەچوو؟

هەمیشە بە نارەزایی و خەفەتەوە دەیگوت: نا.

سێ ساڵ زیاتر بوو چاوەڕێی مافی پەناهەندەیی دەکرد.

هەموو جارێکیش کە خواحافیزیمان لەیەکتر دەکرد، دووایین قسەی ئەویش ئەمە بوو:

– ئاغای فەرهاد.. ئیشێکت هەر بۆم نەدۆزییەوە؟

ڕاستییەکەی، من بەزەییم پێیدا دەهاتەوە. تەنیا بەو مووچە کەمە دەژیا کە لە چێشتخانەیەکی بەرامبەر وێستگەی شەمەندەفەری (سانت لازاغ)، بەبێ مۆڵەتی پۆلیس، هەموو ئێوارەیەکی شەممە و یەکشەمووان قاپوقاچاغی دەشوشت. دەیگوت «ئەو چێشتخانە سنگافوورییە ئەگەر دەرم بکەن، ئیتر من دەمرم لەبرسان».

پێشتریش، لە شاری لیل، کە بە مێترۆ سەعات و نیوێک لە پاریس دوور بوو، لە ڕێستورانتێکی کوردەکان بە ناوی (یۆڵ) لەوێش هەر قاپشۆر بوو. هەر لەناو ڕێستورانتەکەشدا دەنوست. جارێکیان پێم گوت:

– باشە.. تۆ بۆ ناچی بۆ خۆت لە مزگەوتەکان وانەی قورئان بە منداڵە موسڵمانەکان بڵێیتەوە؟

گوتی: لە هەموو پاریس تەنیا یەک مزگەوت هەیە، ئەویش مەغریبی و توونسییەکان قۆرخیان کردووە بۆ خۆیان.

– ڕاگەیاندراوێک لەسەر دیواری مزگەوتەکە یان لەسەر دەرگای چێشتخانەکانی (سانت دونیس) هەڵبواسە، ئەو کەسانەی دەیانەوێ منداڵەکانی خۆیان بنێرنە بەر خوێندنی قورئان، با تەلەفۆنت بۆ بکەن. خۆ یەک دونیا موسڵمان لە پاریس هەر هەن.

هەموو جارێک کە ئەم پێشنیارەم بۆی دەکرد، سەرێکی با دەدا و دەیگوت: «نابێ».

من بۆ خۆم لە هوتێلێکی سێ ئەستێرەدا کارم دەکرد. جگە لەمە نیگارکێش بووم، چەند مانگ جارێک هەندێ لە تابلۆکانی خۆمم دەفرۆشتەوە گەلەرییەکانی پاریس و پێی دەژیام. هاوڕێکانم زۆربەیان نیگارکێش، هیچ کەسێکی وام لە پاریس نەدەناسی تا داوای لێ بکەم کارێک بۆ ئەو بدۆزنەوە. کار دۆزینەوە بۆ (مەلایەکی ئێرانیش!) ئەمە جگە لەوەی کە هێشتاش مۆڵەتی پۆلیسیش نەدراوەتێ بۆ کارکردن.

تاقە شتێک من و ئەو مەلا ئێرانییەی بەیەکتر دەبەستەوە، دڵسافی و ساویلکەییەکی ئەوتۆی بوو کە خۆممی بیردەخستەوە. ئەو کاتانەی منیش تازە لەدەست ڕژێمی بەعس ڕام کردبووە ئەوروپا و کەسم نەدەناسی تا داوای کار یان یارمەتییەکی لێ بکەم.

– باوباپیرانم بەئەسڵ خەڵکی قەزوینن، لە زەمانی (کوودەتاکەی مسەدەق)دا باوانم هاتوون بۆ تاران و ئیتر لەو کاتەوە بووینەتە تارانی.

لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «گوناحە».

محەمەدی حاجی زادە، لە پاریس، ماوەیەکی زۆر لای ژن و مێردێکی هاوشاری خۆی (مورتەزای گوڵچین و فەرەحناز خانم) دەژیا. ماوەیەکیش لای هاوڕێیەکی عەرەبی جەزائیری لە (پیگال) کە دەیگوت دوکانێکی بچکۆڵەی لەبەرامبەر زانکۆی (ژووسیۆ) هەیە و قورئان و سەفەرنامە و کتێبە کلاسیکەکانی بۆ بەرگ دەکا. دوواتریش لە پاریسی پێنجەم، دەیگوت نزیک مێترۆی (پلاس مۆنژ) لە شەقامی (توورنەفۆرت) لە بەشێکی ناوخۆیی قوتابیان بە ناوی (کۆنکۆردیا)، کە هاوڕێیەکی ئەفغانیی خۆی – بوورسی خوێندنی هەبوو – جێگەی بە قاچاغ بۆ کردب[mmوە.

من ئێواران بۆ لای هاوڕێ خاوەن گەلەری و نیگارکێشەکانم دەچوومە (مۆنتماخت Montmartre). زۆربەی جار ئەویش دەهاتە ئەوێ:

– ماڵەکەم لێرە نزیکە و سەبووریم بە تۆ دێ.

دەمزانی دڵی بەو قەرەباڵغییە رەنگینەی مۆنتماخت دەکرایەوە، بەتایبەتیش لەو ڕۆژەوەی کاتێ لەگەڵ ئەو ژن و مێردە تارانییەی هاوشاری خۆی (کە لە ماڵیان دەنوست) پێکرا لەگەڵ ساقی گوڵچین، خوشکی مورتەزا (کە لە سان فرانسیسکۆوە یەکەمین جاری بوو بێتە پاریس) ئێوارەیەک، دەعوەتم کردنە یەکێک لە چێشتخانە گرانبەها و خۆشەکانی مۆنتماخت Chez Les Brazi-liens، لەوێ تا نیوەشەو گوێمان لە مۆسیقا و گۆرانیی بەرازیلی ڕاگرت. ئیتر لەو ڕۆژەوە، محەمەدی حاجی زادە بەیناوبەین دەهاتە مۆنتماخت:

– مافی پەناهەندەیییەکەت هەر بۆ دەرنەچوو؟

– ئیشێکت هەر بۆم نەدۆزییەوە؟

ئەم دیالۆگە بەردەوام دووبارە دەبووەوە.

ڕاستییەکەیشی، من بەهۆی محەمەدی حاجی زادەوە بوو کە ساقی گوڵچین، خوشکی مورتەزا گوڵچینم ناسی، خاوەن ناودارترین گەلەرییەکانی سان فرانسیسکۆ لە ئەمەریکا.

ژنێکی جوان، کەڵەگەت، تەمەن دەوروبەری چل ساڵ، چاو و برۆ ڕەش، زۆر کۆک.. هەر لە یەکەمین دیمانەوە هەستم پێی کرد کە لەو ژنە ڕۆشنبیرە مێیانەیە، بەهۆی ڕووخانی شای ئێرانەوە ئەویش ئاوارەی ئەمەریکا بووبوو؛ لە شاری سان فرانسیسکۆ گەلەرییەکی بۆ خۆی دامەزراندبوو، تابلۆی لە تورکیا و ئەورووپای ڕۆژهەڵات و وڵاتانی عەرەبییەوە دەکڕی و دەیبردنەوە بۆ سان فرانسیسکۆ لە گەلەرییەکەی خۆی دەیفرۆشتنەوە. مورتەزای برای ساقی گوڵچین مەتحی منی لای ئەو کردبوو، پێی گوتبوو کە «نیگارکێشێکی کورد لە پاریس هاوڕێمانە؛ ئەگەر هاتیت بۆ پاریس.. وەرە تابلۆکانی لێ بکڕە یان هیچ نەبێ تابلۆکانی، لە گەلەرییەکەی خۆتدا پێشچاو بخە بۆ کڕیارەکانی خۆت».

– لە سەدا سی و پێنجی نرخی تابلۆکان بۆ گەلەرییەکەی من.

گوتم: گەلەرییەکانی پاریس تەنیا لە ۲۵/۰ دەگێڕنەوە.

ساقی گوڵچین گوتی:

– کەواتە، لە سەدا سی بۆ من بێت، چونکە بار و بردنیشی هەر لەسەر خۆم دەبێ.

من گوتم: لە سەدا بیست بەسە.

گوتی: با لە سەدا بیست و پێنج بێ.

– با لە سەدا بیست و پێنج بێ.

لەگەڵ ساقی گوڵچین هەر لەناو ڕێستورانتە بەرازیلییەکەدا گرێبەستێکمان ئیمزا کرد.

ئەو شەوە، لەسەر شەرەفی ساقی گوڵچین، خوشکی مورتەزا، خاوەن ناودارترین گەلەری لە سان فرانسیسکۆ، کە هاتبووە پاریس سەردانی براکەی بکا، هەموویان دەعوەتی من بوون. نیوەشەو، شامپانیایەکی فەرەنسیشمان، بەبەر چاوی مەلا محەمەدی حاجی زادەوە – کە بەدرێژاییی ژیانی (تا ئەوکاتە) هەرگیز دەمی لە ئەلکهوول نەدابوو– بەسەر مێزە پانوپۆڕەکەماندا تەقاندەوە.

– نۆشتان بێ، بەڵام من ناخۆمەوە.

لەو ئێوارە خوانەی مۆنتماختەوە، لەگەڵ محەمەدی حاجی زادە، کاتێ دەهات بۆ مۆنتماخت، جارجار قاوەیەکمان پێکەوە لەسەر کۆنتواری قاوەخانەیەکی ئەوێ دەخواردەوە.

بەڵێ؛ لە سای ناسینی **محەمەدی** حاجی زادەوە بوو کە من بەردەوام تابلۆکانی خۆمم بۆ خاتوو ساقی گوڵچین دەنارده ئەمەریکا و لەوێ لە گەلەرییەکەی خۆیدا بۆمی دەفرۆشتەوە. هەر بۆیەش، لەئاست محەمەدی حاجی زادە، هەمیشە هەستم دەکرد کە من مننەتباری ئەوم و هەر دەبێ بەشێوەیەک لە شێوەکان سوپاسگوزاریی خۆمی پێشکەش بکەم.

بەبیرمە، ئەو ئێوارەیەی ساقی گوڵچین پاریسی بەجێ هێشت و بیست و شەش تابلۆی منی لەگەڵ خۆی بردە سان فرانسیسکۆ، محەمەدی حاجی زادە پێی گوتم:

– لێدە ئیتر.. ئەم تابلۆیانەت ئەگەر هەموویان بەو پارەیەی کە لەگەڵ ساقی خانم لەسەری ڕێک کەوتن، بفرۆشرێن؛ ئیتر لە سای منەوە دەوڵەمەند دەبیت.

محەمەدی حاجی زادە ئەو ئێوارەیە، دوو جاران ئەم قسەیەی دووپات کردەوە.

منیش ئیتر، بێ ئەمەک نەبووم؛ دووای مانگ و نیوێک –کاتێ ساقی گوڵچین نرخی پێنج لە تابلۆکانمی لە سان فرانسیسکۆوە بۆم خستە سەر ژمارەی بانکەکەم، چووم سێ سەد فرەنکم لەو پارەیەی نرخی تابلۆ فرۆشراوەکانم بەخشییە محەمەدی حاجی زادە؛ تابلۆیەکی گەورەی فیگەرەتیڤی خۆشمم بەدیاری پێشکەش کردە ماڵی برای ساقی خانم.

ساقی گوڵچین، ئەو ژنە کۆک و نازەنینە، وای لێ هات وردە وردە بووینە هاوکاری یەکتر. هەموو چەند مانگ جارێک دەهاتە پاریس چەند تابلۆیەکی (جالبی) لە نیگارکێشە یۆنانی و چینی و کووبایی و عەرەبەکانی مۆنتماخت دەکڕی:

– لە پاریس جۆرە ستایلێکی نەرم هەیە کە لە ئەمریکا نییە، کڕیاری ئەمریکا زۆر حەزیان لەم جۆرە ستایلەیە.

هەر جارێک پازدە بیست تابلۆی منی لەگەڵ خۆی دەبردە سان فرانسیسکۆ و دووای ماوەیەک، نرخی تابلۆکانمی، بە لە سەدا بیست و پێنج قازانج بۆ خۆی، بۆم دەخستە سەر بانکەکەم.

هاوکاریی بەردەوامی من لەگەڵ ساقی گوڵچین گەیشتە هاوڕێیەتییەکی ئەوتۆ کە هەر جارێک بهاتایە بۆ پاریس، نەدەچووە هوتێل، نەشدەچوو بۆ ماڵی مورتەزای برای؛ دەهات چەند شەوێک لە ماڵی مندا دەمایەوە. تەنانەت لە کۆتاییدا، هەر جارێک پێش ئەوەی لە سان فرانسیسکۆوە یان لە پراگ و ئەستەمبۆڵەوە بەڕێ بکەوتایە، پێشوەخت تەلەفۆنێکی بۆ من دەکرد و خۆم دەچوومە پێشوازیی ئەو لە فڕۆکەخانەی شارڵ دیگۆڵ لە پاریس.

بەم شێوەیە، محەمەدی حاجی زادە، هەستم دەکرد بۆ خۆی نەگبەتی بوو؛ بەڵام بۆ من خێر و بەرەکەت.

لەوانەیە هەر ئەم هەستەشم بوو وای لێ دەکردم کە هەرگیز لە محەمەدی حاجی زادە وەڕەس نەبم و پشتی تێ نەکەم.

هاوڕێ نیگارکێشە کوردەکانم بەلایانەوە زۆر سەیر بوو کە من لەگەڵ (مەلایەکی ئێرانی) هێندە برادەرم. وای لێ هاتبوو هەر جارێک منیان بەبێ ئەو لە مۆنتماخت دیبا، بەتانووتەوە پێیان دەگوتم: «مەلا چۆنە؟».

من بە هەڵوێستێکی ئەخلاقیم دەزانی کە پشت لە محەمەدی حاجی زادە نەکەم. مەلایەکی ئێرانی، مرۆڤێکی ڕاکردووی دەست شەڕەکان، وەک هاوڕێ نیگارکێشەکانی ترم، وەک هەموومان، وەک سەدان کەسی دیکەی ڕاکردووی دەست دیکتاتۆریەت و شەڕی عێراق – ئێران، ناچار، ئەویش هاتبووە پاریس داوای مافی پەناهەندەیی بکا.

## پیاوێکی ئەوپەڕی ڕاستڕەو
## لەگەڵ ژنێکی ئەوپەڕی چەپڕەو

– لە ئێران، هەر کاتێک ڕێژێم گومانی بکەوێتە سەر مەلایەک کە دژی دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامیی ئێرانە، یان ئەگەر هەست بکەن ئەو مەلایە بەتەواوەتی پەیڕەوی فەرمانەکانی ڕێژێم ناکات، ئەوا دەسەڵاتی لێ دەسەننەوە و (خەلعی لیباس)ی دەکەن.

من نەمدەزانی (خەلعی لیباس) چییە.

– جلوبەرگی مەلایەتیی لێ دەسەننەوە و چیتر شەرەفی ئەوەی نامێنێ کەشیدەی مەلایەتی لەسەر بنێ.

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

– نەک تەنیا من، هەزاران مەلای تر لە ئێران، کە هەر هەموشیان لە (حەوزەی علمیة) پلەی باڵایان هەبوو، خەلعی لیباس کراون. زیندانەکان تا ئەمڕۆش پڕن لە مەلا و پیاوانی دینی.. بەتایبەتیش لە ڕۆژی حەپسکردنی ئایەتوڵڵا (مونتەزەری) بەملاوە.

– لەبەرچی؟ بۆ؟

– لە ئێران دادگای تایبەت بە دادگاییکردنی مەلاکان هەیە، پێی دەڵێن (حاکمی شەرع).

– باشە، ئەم خەلعی لیباسەی تۆ لەسەر چی بوو؟

محەمەدی حاجی زادە گوتی:

– من ڕام وابوو کە دین دەبێ لە دەوڵەت تا ڕادەیەک جودا بکرێتەوە، ئێمەی

مەلا و پیاوانی دین نابێ هێندە کارمان بەسەر سیاسەتەوە هەبێ. هەموو نەتەوەکانی غەیری فارس دەبێ مافی کولتووریی خۆیان هەبێ.. ئەمانەشم بەئاشکرا لەناو غودبەکانمدا و لەناو خەڵکدا باس دەکرد، نەمدەشاردەوە.

سەیر لەمەدا بوو، محەمەدی حاجی زادە، کەچی، بەردەوامیش بەرگریی لە (سیستەمی کۆماری ئیسلامی) دەکرد لەناو سیستەمەکانی دیکەی بەڕێوەبردنی جیهانی ئەمڕۆدا. دەیگوت «سیستەمی کۆماری ئیسلامی لە هەموو سیستەمێکی تری سیاسی، بۆ ئێمەی موسڵمان، گونجاوترە».

بەئاشکراش ڕەخنەی لە سیستەمی سەرمایەداری دەگرت و پێی وابوو کە «ئەمریکا و فەرەنسا و ئینگلستان و و ڕووسیا، هەر لەکۆنەوە، لەسەر ڕووتاندنەوەی خێر و بێری وڵاتانی ڕۆهەڵات دەژین».

لەناو ئەو هاوڕێ نیگارکێشە کوردانەم کە لە مۆنتماخت کاریان دەکرد، (پشتیوان) خەڵکی کەرکووک بوو، دەیگوت:

– ئەو پیاوە، کەسێکی گومان لێکراوە.. لێی دوور بکەویتەوە باشترە!

(هەژار) کوردی ماردین بوو، دەیگوت:

– هاوتیپی تۆ نییە.. فەرهاد!

(ئەرشەدی قازی) کوردی مهاباد، دەیگوت:

– جاسووسە.

(کامیل) خەڵکی قامشلی:

– عەمامە بەسەرەکان ناردوویانە بۆ ئێرە.

(عەلی هادی) کوردی فەیلی، دوو برای لە شەڕی عێراق و ئێراندا ساڵێک لەمەوبەر کوژرابوون (دەیگوت یەکێکیان لە سەنگەری دیزفووڵ ئەوەی دیکەش لە کاتی هێرشکردنە سەر شاری بەسرا) هەمیشە گاڵتەی بە عەقڵم دەکرد و پێ دەکەنی:

– ئاخر مەلا، کەی هی باشیان تێدا هەبووە؟

سەرەڕای هەموو ئەو قسانە، من باوەڕم بە پاکی و ڕاستگۆیی محەمەدی حاجی زادە زۆر دەکرد. بەتایبەتیش چونکە -دەمدیت- هەمیشە شانازیی بە ئێرانی بوونی خۆیەوە دەکرد. ئەمە جگە لەوەی کە هیچ کاتێک بۆچوونە سیاسی و باوەڕە (ئێرانی)یەکانی خۆی نەدەشاردەوە، بەئاشکرا قسەی خۆی دەکرد. ئەم ڕاستگۆبوونەی، گومانی ئەوەی لەلام نەدەهێشت کە جاسووس بێت یان لەلایەن عەمامە بەسەرەوەکانەوە ناردرابێتە پاریس. بە هاوڕێ نیگارکێشەکانی خۆمم دەگوت:

- ئێمە هەموومان، نە وڵاتی خۆمان جێگەمان بۆ دەکاتەوە، نە وڵاتانی ڕۆئاواش ئامادەن بەخێومان بکەن. لە کۆتاییدا، ئێمەی ڕۆهەڵاتی، هەر یەکەمان بەشێوەی تایبەتی خۆمان، هەتیوین.

- چین؟

«هەتیوین» گوتم. «محەمەدی حاجی زادەش، وەک هەموومان، یەکێکە لەو هەتیوە بێ دایک و باوکانە».

ئەرشەدی قازی گوتی:

- حکوومەتی فەرەنسا خەشیم نییە، فەرهاد گیان. ئەگینا بۆچی ئەوە سێ ساڵ زیاترە، هەمیشە داخوازینامەکەی ڕەد دەکەنەوە؟

ڕاستە؛ ئۆفپرا Ofpra سێ جاران لەسەر یەکتر ڕەفزی کردبووەوە کە مافی پەناهەندەیی پێ ببەخشێ، دووای هەر جارێکیش محەمەدی حاجی زادە دەچوو سەرلەنوێ پارێزەرێکی دیکەی دەگرتەوە. بەڵام ئەمە حاڵی زۆربەی ئەو خەڵکانەی دیکەش بوو کە لە فەلەستین و ئەفغانستان و عێراق و بەنگلادیش و لبنانەوە هاتبوونە فەرەنسا و داوای مافی پەناهەندەییان کردبوو.. ئەوانیش هەر هەموو جارێک وەک ئەم، ڕەفز کرابوونەوە.

لەگەڵ هاوڕێ نیگارکێشەکانم لە مۆنتماخت، نیوەڕۆیەک، هەموومان پێکەوە (لە ڕێستورانتەکەی خۆمان) دانیشتبووین چاوەڕێی پێشخۆر بووین. ئەرشەدی قازی، کە توودەییەکی تۆخی ئێرانگەرا بوو و دەیگوت «من لە

هەمووتان باشتر ئەسڵ و فەسڵی ئەم مەلا تارانییە دەناسم»، دەستی لەسەر مێزەکە دانا:

– ئاغای حاجی زادە لەسەر جیاوازیی بیروڕاکانی، خەلعی لیباس نەکراوە.

– نەمگوت!

– ئەی؟

گوتی: کۆماری ئیسلامیی ئێران، لەسەر بەدڕەوشتی خەلعی لیباسی کردووە.

– واتە چۆن؟

– ئافرەتێکی کۆمۆنیستی ئازەریی کردووەتە ژن و ڕای کردووە بۆ ئەورووپا؛ چونکە نەیویستووە مارەی بکا.

ئەرشەدی قازیی کۆمۆنیست درێژەی بە قسەکانی دا:

– دەڵێن ئافرەتە ئازەرییەکە توودەیی بووە و ویستوویەتی لەگەڵ مەلا پێکەوە ڕابکەنە ئەورووپا، بەڵام مەلا دووای ئەوەی کە ئەوی کردووەتە ژن، نەیویستووە لەگەڵ خۆی بیهێنێتە ئەورووپا؛ بەڵکو ویستوویەتی لەکۆڵ خۆی بکاتەوە.

ئنجا گوتی:

– دەڵێن «ئەو ئافرەتە توودەییە تا ئێستاش لە تاران دەژیت و منداڵێکیشی لە مەلا هەیە».

ئەم چیرۆکە لەناکاوە کە ئەرشەدی قازی بۆمانی گێڕایەوە، هەموومانی سەرسام کرد، بەڵام چەند ڕۆژێک دووای ئەم قسەیەی ئەرشەد، محەمەدی حاجی زادە – خۆی، چیرۆکەکەی، ئاوها بۆ من گێڕایەوە:

– لە سەردەمی زەبر و زەنگ و پەلامارەکانی (ئایەتوڵڵا خلخالی)دا، پاش ئەوەی خەلعی لیباسیان کردم و لە (حەوزەی عیلمیی تاران) دەریانکردم، من دەمزانی کە ئیتر وازم لێ ناهێنن، دەمزانی لەژێر چاودێریدا دەمێنمەوە و حەتمەن چەند هەفتەیەک دوواتریش، بە هەر هەنجەتێک بێت دێن حەپسم

دەکەن و دەمخەنە ناو سەدان مەلای دیکەوە کە خەلعی لیباسیان کردبوون.

تاران ڕاستە شارێکی گەورەیە و دەمتوانی خۆمی تێدا بشارمەوە، بەڵام نەدەکرا تا هەتایە لەژێر چاودێریدا بمێنمەوە. ئەمە جگە لەوەی، هیچ دوور نەبوو چارەنووسی منیش وەک چارەنووسی (مونتەزەری) بکەوتایەتە ناو زیندانەوە. دەترسام بمگرن. بۆیە هەستام ڕام کردە ناو قەوم و قیلەی باوکم لە قەزوین، لەوێشەوە بەرێ کەوتم بەرەو (نەغەدە) بۆ ئەوەی بتوانم لەوێوە سەرهەڵبگرم بەرەو تورکیا و ئنجا ئەوروپا.

لە نەغەدە، لەڕێگەی خزم و خۆیشەکانی باوکمەوە، نەخشەمان وا دانا کە بە قاچاخ، سنووری ئێران - تورکیا ببەزێنین و بگەینە (شەمزینلی) لە تورکیا.

هەڵبەتا لە نەغەدەوە تا سەرسنوور زۆر ئاسان بوو، پەڕینەوەشمان بۆ ئەودیو سنوور، تەنانەت تا گەیشتنیشمان بە (شەمزینلی) ئەویش ئاسان بوو. گرفتەکە لە شەمزینلییەوە دەستی پێ کرد، واتە کاتێ گەیشتینە یەکەمین شاری تورکیا و خۆمان دایە دەستی پۆلیسی تورکیا.

من لە (شەمزینلی) لەگەڵ کچێکی ئازەری، کە کۆمۆنیست بوو و ئەویش وەک من لەدەست کۆماری ئیسلامیی ئێران ڕای کردبوو، وا ڕێک کەوتین کە کاتێ خۆمان دەدەینە دەستی پۆلیسی تورکیا، لەکاتی تۆژینەوەدا بڵێین «ژن و مێردین».

من تا (شەمزینلی) ئەسڵەن ئەو کچە کۆمۆنیستەم هەر نەشدەناسی. کچەکە بە ئەسڵ خەڵکی تەورێز بوو، دەیگوت لە تاران دەژیم. ئەویش، ئۆپۆزیسیۆن، لەدەست ڕژێمی کۆماری ئیسلام وەڕەس، دەیویست ڕابکاتە ئەوروپا و خەباتی سیاسیی خۆی، دژ بە کۆماری ئیسلامیی ئێران، لەناو هاوڕێ توودەییەکانی خۆی لە ئەوروپا درێژە پێ بدا. هەردووکمان لە ڕێگەی بەرەو ئەو شارە سنوورییەی تورکیا، واتە لە ڕێگەی بەرەو (شەمزینلی) یەکترمان ناسی.

ڕاستە، کچەکە کۆمۆنیست و من مەلا بووم؛ بەڵام هەردووکمان لەدەست یەک دوژمن ڕامان کردبوو. ئەم بێزاری و یاخیبوونەی ئێمە دژی کۆماری ئیسلامی ئێران تاقە شتێک بوو من و ئەوی لەیەکتر نزیک کردەوە و کردمانی بە هاوڕێی یەکتر. تەمەنی کچەکە هێندەش لە تەمەنی من بچووکتر نەبوو. سی ساڵان بوو.

مرۆڤ لەکاتی تەنگانەدا دەست بۆ هەموو شتێک درێژ دەکا لەپێناو ئەوەی ڕزگاری ببێت، دەزانی!

من و ئەو کچە ئازەرییەش، ئەگەرچی من مەلا بووم و ئەو کۆمۆنیست، بەڵام هەردووکمان دەمانویست بە هەرچی شێوەیەک بێ لەو دۆزەخەی ئێران ڕزگارمان ببێت.

بریارماندا لەلای پۆلیسی تورک بڵێین کە ئێمە ژن و مێردین. ئەم ڕێککەوتنەشمان تەنیا لەپێناو ڕزگارکردنی خۆمان بوو، بۆ ئەوەی زووتر و ئاسانتر ڕزگارمان ببێ. چونکە لە تورکیا، هەم لای پۆلیسی تورک و هەم لای پۆلیسی Un ، دەمانزانی، پەناهەندە ژن و مێردەکان زیاتر ڕێزیان لێ دەندرا و فایلەکەیان بەپەلەتر بەڕێ دەخرا. واتە ئەگەر بمانگوتایە ئێمە ژن و مێردین، فایلەکەمان زووتر لێی دەکۆڵدرایەوە و زووتر بەرەو ئەورووپا بەڕێ دەخراین. ئیتر، ئاوها، هەرکە خۆمان دا دەستی پۆلیسی تورکیا، لە یەکەم ساتەوە گوتمان، کە ئێمە ژن و مێردین.

بەم شێوەیە، لە شەمزینلی بەمەلاوە، لەگەڵ (هومەیلا) واتە لەگەڵ ئەو کچە کۆمۆنیستە ئازەرییە، بەپێی گرێبەستێکی قانوونی کە بە دەس هەڵبەست لەناو کوردە قاچاغچییەکانی شەمزینلی لە ماوەی نیو سەعاتدا بەپەلە دروستمان کرد، ژن و مێرد بووین.

ئەو ئەفسەرانەی تۆژینەوەیان لەگەڵ دەکردین سەریان سوڕ مابوو، منێکی مەلا و ئافرەتێکی کۆمۆنیست چۆن بووینەتە ژن و مێرد!؟ بەڵام ئێمە، پێشتر، بۆ وەڵامدانەوەی ئەم جۆرە پرسیارانە خۆمان باش ئامادە کردبوو..

قسەکانمان پێشوەختە وا دارِشتبوو کە باوەرِمان بەتەواوەتی پێ بکەن.

بەپێچەوانەی ئەوەی پێشبینیمان کردبوو، لە شەمزینلی، ماوەیەکی یەکجار زۆر ماینەوە. پۆلیسی تورک حەوت مانگی رِەبەق ئێمەی هێشتەوە.

لەگەڵ سەدان پەناهەندەی دیکە کە لە عێراق و ئەرمەنستان و گورجستانەوە رایان کردبووە ئەوێ، ئێمەیان لەناو کەمپێکی گەورەدا ئاخنی، دەورمان بە تەلبەندێکی ئەستوور گیرابوو. لە چەندین لاوە پۆلیسی تورک، بەخۆیان و سەگە پۆلیسییەکانیانەوە، پاسەوانییان لێ دەکردین.

دوور لە ئاوەدانی، دەتگوت لە بنی دنیاین. هەرگیز هیچ رۆژێک، لە دەرەوەی ئەو کەمپە دیوار ئەستوورەوە گوێمان لە هیچ هەست و نوستێکی دەرەوە نەدەبوو، لە دەنگی تاق و تۆقی چەکدارەکانی پەکەکە زیاتر کە هەموو شەودرەنگانێک لە دوورەوە دەیانقڵیشاندەوە.

لەناو کەمپەکەدا هەر حەوت رۆژ جارێک بانگیان دەکردین تۆژینەوەیەکی سەرپێیی دیکەیان لەگەڵ دەکردین و.. لەتێکی بچووک سابوونیان دەداینێ و دەیانگوت:

– هێشتا وەڵامتان نەگەرِاوەتەوە.. چاوەرِێ بکەن.

هومەیلای بەناو هاوسەرم، هەر لە سەرەتاوە زۆر نیگەران بوو.

– تورکیا لە ئێران زۆر فاشیست ترە.

زۆر دەترسا:

– هەبێ و نەبێ لە کۆتاییدا دەماندەنەوە دەستی ئێران.

تاقە ئیمتیازێکی من و هومەیلای بەناو ژنەکەم، لەچاو پەنابەرەکانی دیکەی ناو کەمپەکە، ئەوە بوو کە پەناهەندەکانی تر هەموویان لەناو یەک هۆڵی گەرەلاوژەی پرِ لە مێشوولە دانرابوون؛ بەڵام من و هومەیلایان پێکەوە خستبووە ناو یەک ژووری سەربەخۆ، ژووری تایبەتی هاوسەرەکان بوو.

تەنیا کاتی نانخواردن و چوونە سەر دەستاو مۆڵەتیان دەداینێ بتوانین لە

ژوورەکەمان (ئەوانی دیکەش لە قاوشـە گەورەکەیان) بێینە دەرەوە و هەوایەکی تازە هەڵبمژین.

لەناو ئەو کەمپەی (شـەمزینلی)دا حـاڵمان حاڵی سـەگ بوو. هـەمـوو نیوەڕۆ و ئێوارەیەک، سـەدان پەنابەری ناو ئەو کەمپـە گەورەیە، هـەموومـان بەجارێک، لە مـاوەی تەنیا نیـو سـەعاتدا، بـەپەلەپەل، دەچووین ڕیزمـان دەگرت بۆ وەرگرتنی تەنیـا چۆڕکە شـۆربایەکی مـێشـوولاویی پیس.. لەگـەڵ شـەپڵـە گۆشـتـێک کە پارچە نانێکی وشکی بەسەر دادرابوو.

لە مـاوەی یەک هەفـتـەدا هـەر یەکـەمـان تەنـیـا یەک ڕۆژ بـۆمـان هەبـوو بچین سـەرشۆرێک بکەین.

هـەر چۆنێک بێ، زیندانەکەی من و هومەیلای (هـاوسـەرم) کەمێک لە زیندانە گـەورەکـەی پەناهەندەکـانی تر خـۆشـتـر بوو. هـەر هـەمـوو کـەمـپـەکـەشـمـان بەشێوەیەکی گشتی، کەمێک لە زیندانی بەڕاستی خۆشتر.

ئەو کەمپە پیسـەی ئێمە، کە لە حەپسـخانەیەکی ئەشکەنجەدانی سـەدەکانی ناوەڕاست دەچوو، بەتەواوەتی کەوتبووە تەنیشت باڵەخانەی (ڕێکخراوی مافی مـــرۆڤ) لـە شـــاری شـــەمـــزینـلـی. لە دوورەوە، ئـاڵایـەکی بـچـکـۆڵەی ئـەو ڕێکخراوەمان دەدیت، کە لەسەر لووتکەی باڵەخانەکەوە دەشەکایەوە.

حـەوت مـانگی ڕەبەق، من و هومـەیلا، لەناو ئەو ژووره ئینفرادییـەدا خـەریک بوو ڕۆحمان دەتەقی.

ژوورەکـەمـان سـیـسـەمـێکی نوێن تێـدا ڕاخـراوی پـیـسـی دوو نەفـەریی لێ داندرابوو (نەماندەتوانی بڵێین دوو سیسەمی جودای یەک نەفەریمان بۆ بهێنن نەوەک کـەشف ببین)، لەگـەڵ تاخـمـێکی چا و سـەبـەتەیەک مـیـوەی ڕزیو.. پەنجەرەیەکیش؛ کە خۆشبەختانە دەمانـتوانی لەو پەنجەرەیەوە تەماشـای چیا سـەرکـەشـە دوورەکـانی بەرامبـەرمـان بکەین کـە لەودیویانەوە چەند ڕێگایەک دیاربوون و بەردەوام چاومان لێیان دروو‌بوو:

– کەی ڕزگارمان دەبێت بەرەو ئەورووپا؟

حەوت مانگی ڕەبەق!

حەوت مانگی ڕەبەق لەناو ژوورێکدا لەگەڵ کچێک.. لەگەڵ کچێکی کۆمۆنیستی تەورێزیی تازەبەهار!

هومەیلا.. کچێکی مەمک قوتی زۆر تەڕ و بڕ، بەتایبەتیش چاوەکانی، زۆر گەش و جوان، دەتگوت چاوی ئەو حۆرییە نازدارانەیە کە سوورەتی (الواقعة) باسیان دەکا.

هەموو ڕۆژێک بیست و چوار سەعات بەدیار ئەو کچە شۆخ و شەنگە، خۆم پێ ڕانەگیرا. چی بکەم! مردم هێندەی ئایەتەلکورسی بۆ دوورخستنەوەی شەیتانی سێکس لە جەستەی خۆم بخوێنمەوە. مردم هێندەی لە دڵی خۆمدا بە (اعوذ بالله.. اعوذ بالله..) هەوەس و ئارەزووەکان لە گیانی خۆم دوور بخەمەوە. ئیسلام دەڵێ (اذا اجتمع امراة و رجل في مكان ما، فالشيطان ثالثهما). ئەم قسەیە ڕاستە.. دەزانی!

باوەڕ ناکەم هیچ مەخلووقاتێک لەم گەردوونەدا بتوانێ بۆ ماوەی ئەو هەموو مانگە لە ژوورێکی داخراودا لەگەڵ کچێکی نەوبەهاردا بژیت و بشتوانێت بەردەوام ئارەزووەکانی خۆی دابمرکێنێتەوە. ئەرێ تۆ بوویتایە دەتتووانی؟ باوەڕناکەم، هەرگیز.

نەک پیاو، تەنانەت هیچ کچێکیش، بەهەمان شێوە، ناتوانێ بۆ ماوەی ئەو هەموو مانگە، بیست و چوار سەعات لەناو ژوورێکدا خۆی لەهەمبەر ئەو هەموو کەفوکوڵەی خۆی ڕابگرێت! بەدرێژاییی ئەو هەموو مانگە پێکەوە لەناو ژوورێکدا.. تەنیا تەماشای یەکتر بکەین و سوورەتی ئایەتەلکورسی بخوێنینەوە! ماقووڵە؟ نەدەکرا.

سەرت نەیەشێنم ڕۆژێک، دەمەوعەسرێکی پایز، هێشتا زەنگی نانخواردنی ئێوارەیان لێ نەدابوو.. لەناو ژوورەکەماندا بەیەکترەوە نووساین. ئیتر هەر ئەم بەیەکترنووسانە بوو.. بەڕاستی بووینە ژن و مێردی یەکتر.

من زەردەخەنەیەک کەوتە سەر لێوم، لە دڵی خۆمدا گوتم: «تۆ تەماشاکە! پیاوێکی ئەوپەڕی ڕاستڕەو، لەگەڵ ژنێکی ئەوپەڕی چەپڕەو.. زەوق و هەوەس چۆن لەیەکتریان کۆ دەکاتەوە!».

محەمەدی حاجی زادە گوتی:

– لەو ڕۆژە بەدوواوە ئیتر وای لێ هات هەر کاتێک حەزمان لێ بووایە ژن و مێرد بووین.

من پێکەنینیشم دەهات، گوتم:

– ئەی دووایی؟

– دووایی؟ هێشتا چوار مانگ بەسەر ئەم حەپسخانە ئینفرادییەمان تێ نەپەڕیبوو، هومەیلا گوتی: «دەگەڕێمەوە».

– چی؟

– گوتی «من مردم لەناو ئەم زیندانە، ناتوانم چیتر چاوەڕێ بکەم».

– گەڕایەوە ئێران؟

– بەڵێ. باوەڕی نەدەکرد کە یووئێن Un داواکەمانی بەجیدی وەرگرتبێت. ڕاستیش دەرچوو. چونکە منیش ئەگەر لەوێوە ڕام نەکردایەتە یۆنان و لەڕێگەی دەریای ئیجەوە خۆم نەگەیاندایەتە فەڕەنسا.. وا بزانم ئێستاش هەر، لەگەڵ سەدان پەناهەندەی دیکە، هەر لەوێ کەوتبووم.

من بەتەواوەتی باوەڕم بە قسەکانی محەمەدی حاجی زادە دەکرد.

– ئیتر ئەمە بوو. دووای گەڕانەوەی هومەیلا، دیارە دەنگ و دۆڵی ئەوەیان بەدووای مندا بڵاوکردووەتەوە گوایە من دەستدرێژیم کردووەتە سەر ژنێکی ئازەری و لەسەر بەدڕەوشتی خەلعی لیباس کراوم.

من دەمزانی ئەم جۆرە بانگاشەیە دژی خەڵکی ئۆپۆزیسیۆن، زوو بەناو خەڵکدا بڵاودەبێتەوە.

محەمەدی حاجی زادە گوتی:

– ئەمە جگە لەوەی کە ئەم ڕووداوە بەتەواوەتی دووای خەلعی لیباسەکەی من بوو، نەک پێشتر.

– ئەی ژنەکە؟

– هومەیلا؟ .. ئێستا لە تارانە.

تەمی خەفەتێک کەوتە سەر ئادگاری محەمەدی حاجی زادە:

– نامەم بۆ دەنێرێت و دەڵێ «کچەکەت ئێستا گەورە بووە و چاوەڕێت دەکا. هەر کاتێک مافی پەناهەندەییت بۆ دەرچوو، بەدووای ئێمەشدا بنێرە و دێینە لات. حەزدەکەین لەگەڵ تۆ پێکەوە بژین».

محەمەدی حاجی زادە، دووای تەواوکردنی قسەکانی، بە نووکی پەنجەی، یەک دانە فرمێسکی بچکۆڵەی لە قولینچکی چاوەکانی خۆیدا سرییەوە:

– کچەکەمی ناوناوە (شەمزین).

ئنجا قوڵپێکی گریانی دا:

– بە یادی ئەو شارۆچکەیەی...

قسەکەی بۆ تەواونەکرا.

بێدەنگ تەماشای عەرزەکەی دەکرد.

من لەو دەمەدا تێ گەیشتم، محەمەدی حاجی زادە جگە لە سۆزی باوکانەی بۆ ئەو کۆرپەیەی کە هێشتا هەر نەیشیدیوە؛ چەندێک غەریبیی (ژنەکەی)شی دەکا...

ئایا بەتەمایە

ژن و منداڵەکەیشی ڕاکێشێتە پاریس؟

– محەمەدی حاجی زادە ئێستا لەلایەن کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە بە سێ تۆمەت تاوانبارە..

– ڕاستە.

– یەکەم: بەوەی کە لەناو خەڵکدا بیروباوەڕی ئەنتی کۆماری ئیسلامیی بڵاوکردووەتەوە..

– ڕاستە، چونکە کۆماری ئیسلامیی ئێران هەموو بۆچوونەکانی منی بە دڵ نەبوو.

– دووەم: پاش خەلعی لیباسەکەی، لەدەست ڕژێم یاخی بووە و پەنای بردووەتە بەر فەرەنسا..

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت: ئەمەش ڕاستە.

– سێیەم: چونکە لە شاری شەمزینلی کچێکی پاکیزەی کردووەتە ژن بەبێ ئەوەی مارەی بکا.

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت: ئەمەشیان هەر ڕاستە.

ئەرشەدی قازی، هاوڕێ کۆمۆنیستەکەم، لەناو ڕێستورانتەکەی مۆنتماخت، پنتێک بۆیەی کاتی وێنەکێشان بەسەر برۆی چەپیەوە، درێژەی بە قسەکانی دا:

– دە کەواتە، پیاوێک، «*مەلایەکی تارانی*»؛ سێ تاوانی گەورەی لەسەر بێ، چۆن دەبێ هێندە ڕووی بدەیتێ ئاخر.. فەرهاد؟

– ئنجا ئەم سێ تاوانە، بەڕاستی؛ تاوانن.. بە ڕای تۆ؟

– کونکردنی کچێکی پاکیزە تاوان نییە؟

– ئەگەر بەزۆر بێت، با. بەڵام کارەکە بە ئارەزووی هەردووکیان پێکەوە بووە.

– نەخێر، ئەو دەجالە، کچەکەی فریو داوە.

گوتم: نزیکەی چوار مانگ لەناو ژوورێکی ئینفرادیدا پێکەوە بوونە. تۆ دەتوانی پێشبینیی ئەم حاڵەتە بکەی.

– چی؟

– ژن و پیاوێک بۆ ماوەی چوار مانگ لە ژورێکی ئینفرادیدا حەپس کرابن، دەکرێ بەرگە بگرن و هەرگیز دەستیان بەر یەکتر نەکەوێ؟

– ڕاست ناڵێ.

– بەیەکەوە لەناو یەک ژووری ئینفرادیدا بوونە.

– بەزۆر کردوویەتی بە ژن. هەر بۆیەش پاشان جێی هێشتووە.

گوتم: جێی نەهێشتووە، کچەکە خۆی پەشیمان بووەتەوە و گەڕاوەتەوە ئێران.

– ڕاست ناڵێ.

– دەڵێ هەموو شتێک بە بڕیار و خواستی هەردووکمان بووە. ئەمە جگە لەوەی کە ئەو ئێستاش، منداڵ و (ژنەکەی خۆی) زۆر خۆش دەوێ.

ئەرشەدی قازی بێدەنگ ما. هاوڕێکانم هێشتا گوێیان ڕاگرتبوو، گوتم:

– بەردەوام تا ئەمڕۆش نامە لە نێوانیاندا هەیە.

ئنجا گوتم:

– کۆرپەکەی خۆیان ناوناوە (شەمزین) بەناوی ئەو شارۆچکەیەی کە پێکەوە بۆ ماوەی چوار مانگ بە حەپسکراوی لەوێدا ژیاون.

ئەرشەدی قازی گوتی:

– باوەڕ ناکەم لە ئۆفپرا Ofpra وەک پیاوێکی خاوەن ژن و منداڵ خۆی ناونووس کردبێ.

هاوڕێ نیگارکێشەکانم کەوتنەوە قسە:

– حەتمەن چیی بەسەرهاتبێت، ئەوەی بۆ ئۆفپرا گێڕاوەتەوە.

– ئەگەر باسی ژن و منداڵەکەی لە فایلەکەیدا کردبێت، فایلەکەی بەهێزتر دەکا.

– وابزانم. ئا.

– کەواتە بەتەمایە ژن و منداڵەکەیشی ڕاکێشێتە ئێرە بۆ لای خۆی!

ئەرشەدی قازی گوتی:

– ئەمە جورمێکی کۆمەڵایەتیشە.

– چی؟

– چونکە ئێستا عەشیرەتی کچەکەش هەر لێی نابوورن.

«ئەرێ»، عەلی گوتی، «تۆ دەڵێی مەلایت، لەوێوە دانیشتووی قسە دەکەی!»؛ «ئەوە چیتە.. کامیل؟»

– مەلا نیم، بەڵام نەریتی ئازەرییەکان ئەوە قبووڵ ناکا کچێکیان لەلایەن مەلایەکی نەگریسەوە دەستدرێژیی سێکسیی بکرێتە سەر.

– دەستدرێژیی نەکردووەتە سەر.

– لە ناعیلاجی تووشی داوی یەکتر هاتوون.

– ئیشەکە بە حەزی هەردووکیان بووە.

– درۆ دەکا.

– لەوانەیە هەر ئەسڵەن مەلاش نەبێ، دەزانی!

ئەرشەد ئاوها گوت.

– چۆن؟

– لەوانەیە لەتاو بێکاری ڕای کردبێت و ئەم سیناریۆیەی لێرە بۆ خۆی دروست کردبێت!

عەلی هادی بە ئەرشەدی گوت:

– تۆ لەبەرئەوەی خۆت تووەدییت بۆیە هێندە بەرگری لەو ژنە تووەدییە دەکەیت و هێرش دەکەیتە سەر ئەم مەلا بەستەزمانە.

– نەخێر.

– کێیسی ئەم مەلا بەدبەختە.. زۆر ئاڵۆز دیارە.

– ئەمە سێیەم جارە ڕەفز دەکرێتەوە.

– وەڵڵاهی موستەهەقی ئەوەیە پێی بدرێ!

– هیچ موستەهەق نییە. ئەسڵەن جاسووسیشە.

ئەرشەدی قازی وای دەگوت؛ هەمیشە.

## بزن له وڵاتی ئێمەدا
## لەچاو مرۆڤ، زۆر ئازادترە

– له ئێرانەوه بەقاچاغ بەرەو تورکیا دەڕۆیشتین، له ناوچەرگەی ڕەشماڵی کوردەکاندا، له نێوان گوندەکانی نێوان شنۆ و ئەولای سنووری تورکیادا؛ پاسدارانی ئێران و سەربازانی تورک هەر ئان و ساتێک بۆیان هەبوو بماندەنه بەر ڕێژنەی گولله. بەردەوام لەو سەرسنووره پڕ مەترسییەدا دەستمان لەسەر دڵمان بوو. لەو کاتەدا بەبیرمە، تەماشای مێگەله بزنێکم دەکرد، مێگەله بزنێکی ڕەوەندە کوردەکانی سەر سنووری نێوان ئێران-تورکیا... ئەو بزنانه چەند ئازاد لەناو ئەو شینایییه بەهەشتییەدا بۆ خۆیان دەسووڕانەوه! ئەو بزنانه چەند ئارام، بێ ئەوەی بترسن، بەوپەڕی ئازادییەوه لەسەر ئەو سنووره بۆ خۆیان دەلەوەڕان و دەهاتن و دەچوون.. هیچ مەترسییەکی ئەوەیان نەبوو هیچ کەس داوای ناسنامەیان لێ بکا؛ هیچ نیگەرانییەکی ئەوەیان نەبوو هیچ سەربازێک لەناکاو بیانداته بەر ڕێژنەی گولله. ئەو بزنانه نەیاندەزانی مجەوەزی پەڕینەوەی سنوور چییە، گیروگرفتی پەساپۆرت چییە!

محەمەدی حاجی زادە، دووای ئێستێک، قسەکانی خۆی کلۆم دا:

– لەو کاتەدا بەبیرمە؛ حەسوودیم بەو بزنانه دەبرد.

پێ کەنیم گوتم: بۆ؟

گوتی: بزن له وڵاتی ئێمەدا، لەچاو مرۆڤ، زۆر ئازادترە.

من بیرێکم له قسەکەی کردەوه، گوتم:

– له هەموو وڵاتێک مرۆڤ پێویستە پەساپۆرتی هەبێ بۆ ئەوەی بتوانێ

بچێته وڵاتێکی دیکه.

مـحـەمــەدی حــاجی زاده گـوتـی: نەخـێـر.. دەوڵەتـەکـانـی ئەورووپا مــرۆڤی ئەورووپاییان لەدەست ئەم حەسوودی بردنه به بزن ڕزگار کردووه.

دیسان پێ کەنیم، گوتم: چۆن؟

– ئەمـەتا خـەریکن بیـر لەوه دەکـەنەوه کـه بەهـۆی (یەکیـەتیـی ئەورووپا)وه مرۆڤی ئەورووپایی بەتەواوەتی لـەدەست پەسـاپۆرت و سنوور ئازاد بکەن. ئەمـه گرینگترین کارێکه کـه ئەورووپا بۆ مێژووی مرۆڤـایەتیی خـۆی دەیکا. دەزانی؟ هیچ یەکێک له دەوڵەتانی ئیسلام تا ئێستا بیریان لەمه نەکردووەتەوه.

تێ گەیشتم مەبەستی چییه، گوتم:

– لای ئێـــمـــەش.. نـەک لـه وڵاتێکەوه بـەرەو وڵاتێکی دراوسێ، بەڵکو لـه شـارێکی نـاو هـەمان وڵاتی خۆتەوه تا دەگەیته شـارێکی تر، چەندین جار داوای ناسنامەت لێ دەکەن.

محەمەدی حاجی زاده گوتی:

– من، ئێسـتـاش، هـەر کـاتێ بزنێک ببـینم ترس و دڵەڕاوکـێی ئەو ڕۆژەی سەرسنووری ئێران و تورکیام بیر دێتەوه.

ئنجا به پێکەنینێکی کورتخایەن:

– ئێستاش هـەر حەسوودی به بزن دەبم.

گوتم: ئەوسا لەسـەر خاکی خۆت و لەناو وڵاتی خۆتدا..

– ئێستاش له ئەورووپا و لەسـەر خاکی مەسیحییاندا.

من بێدەنگ بووم، ئەو درێژەی به قسەکەی دا:

– ئێـمـەی مـرۆڤـی ڕۆژهەڵات زۆر گـوناحـین، عـەینەن ئـادەم کـه له بـەهەشت دەرکرابین.

من حەزم دەکرد گوێدێری بۆچوونەکانی ئەو مەلا تارانییه بم، پرسیم: چۆن؟

گوتی:

– ئێمە، هەم وڵاتی خۆمان دەرمان دەکات و ئازادیمان لێ دەسەنێتەوە، هەم وڵاتانی ڕۆئاواش دەرگامان لەڕوو دادەخەن. سەرگەردان و دەرکراوی هەمیشەیی، هەرگیز نابینە خاوەن ناسنامەی تایبەتی خۆمان. ئێمە هیچ ناسنامەیەکمان نییە.

ئنجا بە هەستێکی برینداری تووڕەوە:

– من ئێستا چیم؟ کێم؟ بەس پێم بڵێ!

گوتم: هەست ناکەی کە ئێمە.. لێرە.. هیچ نەبێ ئازادین؟

محەمەدی حاجی زادە ڕاستە لە پاریس ئازاد بوو و دەستی کۆماری ئیسلامیی ئێرانی پێ نەدەگەیشت، بەڵام سێ ساڵ زیاتر بێ ناسنامە، بێ پەساپۆرت، بێ مافی کارکردن.. حەوسەڵەی هیچی نەمابوو.

– ئازادی، بەبێ ناسنامە و بێ توانای گوزەر، ناتگەیەنێتە هیچ.

گوتم: ئاخر خۆ وڵاتانی ڕۆئاواش مەجبوور نین هەرچی دەرکراوەکانی ڕۆهەڵات هەن دووبارە ناسنامەیەکی تازەیان بۆ دروست بکەنەوە و لەوڵاوە بەخێویشیان بکەن. جەنابت ئەمە دەزانی. مەبەستم؛ ئەمە ئەرکی دەوڵەتانی ئەورووپا نییە.

محەمەدی حاجی زادە زمانی ئینگلیزیشی زۆر باش دەزانی. پێ دەچوو بەڕاستی هەر لەو کاتەوەی لە ئێران بووە بایەخدانی بە سیاسەت کەم نەبووبێ؛ بە هەناسەساردییەوە گوتی:

– دەزانم.

ئنجا بە ئاوازێکی گازاندەبارەوە گوتی:

– ئەگەر سەرکردەکانی ئیسلام و ڕێبەرە موسڵمانەکان وڵاتەکانی ئێمەیان نەکردایەتە ئەم زیندانە گەورەیەی ئەمڕۆ؛ ئێمە بۆچی پەنامان دەبردە بەر وڵاتانی کافر لە ئەورووپا؟

- وایە.

- ئەگەر دەوڵەتە موسڵمانەکانی خۆمان باش بوونایە.. ئێمە بۆچی ناچار دەبووین پەنا ببەینە بەر وڵاتانی کافری ئەوروپایی!

محەمەدی حاجی زادە، دووای سێ ساڵ مانەوە لەناو وڵاتی فەرەنسا، هێشتاش هەر بە (ئەورووپای کافر) قسەی دەکرد. لە کۆتاییدا هەناسەیەکی هەڵکێشا:

- هەر چۆنێک بێ.. ئەم حەکایەتە زۆر کۆنە. ئەم بێ عەقڵی و نامرۆڤایەتییەی حوکامی ئیسلام لەناو وڵاتانی خۆماندا ڕەگوڕیشەیەکی دێرینی هەیە. سەید جەمالەدینی ئەفغانی، جوانترین رووی ڕێنسانسی ئیسلام کە لە بنەچەی پێغەمبەریش بوو، کەچی ناچاریان کرد پەنا بباتە بەر ئەوروپا و داوای ڕەگەزنامە لە وڵاتی کافران بکا. بۆچی؟

ویستم قسەیەک بکەم، لە من بەلەزتر گوتی:

- چونکە لەسەر خاکی موسڵماناندا تەنانەت تاقە بستێکیش نەماوە کە مرۆڤ بتوانێ تێیدا ئاسوودە و ئارام بژیت.

محەمەدی حاجی زادە زۆر بەتوورەییەوە ددانی لەسەر یەکە یەکەی ئەو وشانە دادەگرت کە دەیگوتن. هاوڕێ نیگارکێشە کوردەکانم لە مۆنتماخت، بەتایبەتی ئەرشەدی قازی، ئەگەر لەو ساتانەدا گوێیان لە ئاوازی نارەزاییی ئەم قسانەی محەمەدی حاجی زادە بووایە، موستەحیل بوو چیتر باوەڕ بکەن کە ئەم پیاوە جاسووس یان نێردراوی کۆماری ئیسلامیی ئێران بێ.

محەمەدی حاجی زادە، دووای ئەم هەموو ساڵ چاوەڕووانییە بەهیوای وەرگرتنی مافی پەناهەندەیی، دیسان ڕەفزی بۆ هاتبووەوە.. تووشی حاڵەتێکی دەروونیی نالەبار و ڕەتێن هاتبوو. هەستم دەکرد بەدەست ئەم گرفتەوە زۆر ماندوو بووە، چونکە بەبێ کارتی ئیقامەی پۆلیس بۆی نەبوو هیچ کارێک بکا تەنیا کاری ڕەش نەبێ، قاپشۆری لە چێشتخانەکاندا یان بارگواستنەوە، یان گوڵ فرۆشتن لەسەر جادەکان.. کە ئەمەش لە پیاوێکی چل

و پێنج ساڵەی ئێرانی نەدەوەشایەوە بەتایبەتیش چونکە ئەو لە وڵاتی خۆیدا مەلایەک بوو، ئەمە جگە لەوەی کە پلەیەکی باڵایشی لە (حەوزەی عیلمیە)دا هەبوو.

خەریک بوو پێی بڵێم:

– تۆ بۆ ناچیتە وڵاتێکی دیکە؟ بۆ نموونە سوێد؟

ئاوهام پێ نەگوت، چونکە دەمزانی لەوانەیە ئەم کارە پارەیەکی زۆری بوێت و ئەو نەیبێ؛ پاشان ئەمڕۆ هیچ وڵاتێکی ئەوروپا بەئاسانی مافی پەناهەندەیی نادات (مەلایەکی تارانی) کە *لە وڵاتی خۆیدا هیچ مەترسییەکیشی لەسەر نەبووبێت!*

ویستم پێی بڵێم:

– تۆ بۆچی قەیرە ژنێکی پیر یان دەڵەقۆڕێکی ناشیرین بۆ خۆت نادۆزیتەوە مارەی بکەیت، بەڵکو لەم ڕێگەیەوە ئیقامەی فەرەنسیشت پێ ببەخشن؟

ئاوهاشم پێی نەگوت. بێدەنگ بیرم دەکردەوە.

لەناو بێدەنگییە غەمگینەکەی هەردووکماندا محەمەدی حاجی زادە گوتی:

– من دووای ئەوەی کە ئەم هەموو پێشکەوتنە گەورەیەی لە فەرەنسا بینیم، بەڕاستی باوەڕ ناکەم جارێکی دیکە ببڕای ببڕ ڕوو بکەمەوە ئەو دۆزەخەی وڵاتی خۆم.

گوتم: بەڕاست؟

– بەڕاست.

یەکسەر شاعیرێکی تورکی سەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیم بیرکەوتەوە کە لەدەست سوڵتان عەبدولعەزیز ڕای کردبووە فەرەنسا و بەپەناهەندەیی لە پاریس دەژیا، گوتم:

– زیا پاشا لە کۆتاییی سەدەی نۆزدەمدا لە دێرە شیعرێکیدا دەڵێ:

من کە بە سەرزەمینی بێ ئیمانەکاندا تێ پەڕیم

چەندین شار و تەلارم دی

کەچی کە بەناو مەملەکەتی ئیسلامدا تێ پەڕیم

لە کەلاوە زیاتر هیچی دیم نەدی

– ڕاستە

ئنجا زەردەخەنەیەک کەوتە سەر لێوی:

– خەریکە وردە وردە دێمە سەر باوەڕی تۆ؛ باوەڕ بە بۆچوونەکانت دەهێنم.

– کام بۆچوون؟

– ئێمەی حوکامی ئیسلام خۆمان وڵاتی خۆمان لە خۆمان کردووەتە دۆزەخ.

ئنجا تەماشای خاڵێکی دووری کرد:

– بە هەرچی نرخێک بێت، من پێویستە مافی پەناهەندەییەکەم لێرە وەدەست بهێنم.

## له نێوان عەرەبێک و دوو جوولەکەدا

هوتێل (ئەورووپا)

شەقامی ترێڤیز، ژمارە (٧). پاریسی دەیەم.

چەندین ساڵ ئەمە بوو ناونیشانی گەنجێتیی من له پاریس.

هەموو ڕۆژێک (تەنیا ڕۆژانی شەممە و یەکشەممە نەبێ) له سەعات هەشتی ئێوارەوە تا سەعات هەشتی بەیانی، له پێشوازیی هوتێلەکەدا (بەرپرسی یەکەم) بووم.. بە خۆمم دەگوت (خاوەنماڵم).

مەدام گالاتتی، لەگەڵ مسیۆ لووسیانای کوڕی، بەبنەچەکە جوولەکەی پورتوگاڵ، هەر لە ساڵانی پەنجاوە ڕەگەزنامەی فەرەنسییان وەرگرتبوو؛ خاوەنی هوتێلەکە.. تا بڵێی تەبا و ڕێکوپێک بوون لەگەڵمدا.

تەنیا شەممە و یەک شەموان نەبێ، نانی بەیانی و ئێوارەشم هەر لەناو هوتێلەکە دەخوارد. هەروەها خواردنەوە و خوێندنەوە و گەلێک جاران نیوەشەوان تابلۆکانیشم هەر لەناو مەتبەخی هوتێلەکە ڕەسم دەکرد.

مەدام گالاتتی بۆ خۆیشی دەیزانی – ڕاستییەکەی مۆڵەتی دابوومێ – کە له کاتی پێویستدا (بەڵام تەنیا نیوەشەوان) تەنانەت دووشێکیش له یەکێک له ژوورەکانی نهۆمی خوارەوەدا وەربگرم.

ئەگەرچی تەلەڤزیۆن بەرامبەر کورسییەکەم له هۆڵی پێشوازیدا داندرابوو بەڵام بەدەگمەن تەماشای تەلەڤزیۆنم دەکرد. چونکە له هەموو هەفتەیەکدا سێ چوار ڕۆژ دەچووم سەردانی کتێبخانەکەی گەڕەکم دەکرد کە تەنیا چەند مەترێک له هوتێلەکەمەوە دوور بوو. هەر جارێک دەچووم، حەوت کتێب،

بەتایبەتیش ئەلبوومی نیگارکێشە ئەوروپاییەکانم، دەگەڵ خۆمدا دەهێنایەوە هوتێلەکە؛ هەمیشە چوار کۆواری جۆراوجۆری هونەری شێوەکاریش بەتایبەتی Connaissance des Arts و Art Presse کە متوویان ببووم.

شەوان لە سەعات دە و نیوەوە، کاتێ هوتێلەکە خامۆش، هەموو میوانەکان گەڕابوونەوە ژوورەکانیان، ئیتر ژیانی هونەریی من دەستی پێ دەکرد: دەرگای هوتێلەکەم کلۆم دەدا و دەچوومە ناو کافتیریاکە. لەناو مەتبەخ، لاپەڕەی ڕۆژنامە کۆنەکانی لۆمۆند و لۆفیگارۆ یان لیبێراسیۆنم لەسەر عەرزەکە ڕادەخست و بەدەم قاوەخواردنەوەوە دەکەوتمە تابلۆکێشان.

لە میانەی هەر پشوودانێکیشمدا دەچوومەوە سەر ئەو نیگارانەی ناو ئەلبوومەکانی کە لە کتێبخانەی گەڕەکەوە هێنابوومن و تامەزرۆی لێوردبوونەوەیان بووم. جاری وا هەبوو بۆ ماوەی یەک شەو تەنیا لە ئەلبوومی یەک نیگارکێش ڕادەمام و بیرم لە ستایلی تایبەتمەندی یەک هونەرمەند دەکردەوە.

بەم شێوەیە، (هوتێل ئەوروپا) ئەو هوتێلەی کە شەوان لە سەعات هەشتی ئێوارەوە تا هەشتی بەیانی فەرمانبەری پێشوازییەکەی بووم، بۆ من کتێبخانەیەکی مەزن، بەڵکو مۆزەخانەیەک بوو!

من لەو هوتێلەدا بوو کە (مان ڕێی) و (بین ڤۆتییێ) و (ماکس ئێرنست) و (فریدا کالۆ) و (Hundertwasser) و (جاکسۆن پۆڵۆک) و (ماکس ڤالتەر سڤانبێرگ)م ناسی؛ لەگەڵ دەیان هونەرمەندی تریش ئاشنایەتیم گەشەی سەند و چاوم لەگەڵیان کرایەوە.

ئەو تابلۆیانەی لەناو مەتبەخی هوتێلەکەدا تەواوم دەکردن، بۆ سبەینێ هەڵم دەگرتن و دەمبردنەوە بۆ ماڵەوە، یانیش -هەندێکیانم- هەر لەوێوە دەبردن بۆ مسیۆ (سامۆیلیان) خاوەن گەلەریی (ژۆلی) لە شەقامی سێن، کە گرێبەستێکی هەرزانم لەگەڵی هەبوو بۆ فرۆشتنەوەیان.

لە هەموو شتێک زیاتر لەو شەوانەدا کە زۆر مەقەیەت و وریای بووم،

هەمیشە پاکراگرتنی هوتێلەکە بەتایبەتی مەتبەخەکەی بوو. ئەو شوێنەی ڕەسمم تێیدا دەکرد، نەمدەهێشت تەنانەت یەک تنۆک بۆیەش بکەوێتە سەر کاشییەکان یان بەسەر عەرزەکەوە بمێنێتەوە.

ئەو شتەی کە منی، هەر لە هەفتەی یەکەمەوە لەلای ئەو دایک و کوڕە خاوەن هوتێلە (مسیۆ لووسیانا و مەدام گالاتتی) خۆشەویست کرد و زۆرتر منی کردە جێگەی متمانەی هەردووکیان، ڕووداوێک بوو.

من لەوەتەی بەبیرم دێ، شەونشین بوومە. ئەمەش چونکە نیگارکێشان هەمیشە کات و نوستنم لەبیر دەباتەوە و وام لێ دەکا درەنگ بنووم. ئەم خووەی من، هەر لە یەکەم هەفتەی دەوامکردنمدا لە هوتێلەکە، بۆ من بە خێر گەڕا.

وابزانم پێنجەم یان شەشەم ڕۆژی دەوامکردنم بوو لەو هوتێلە، سەعات دەوروبەری سێ و نیوی شەو، لەناو هۆڵی پێشوازیدا، لە جێگەکەی خۆم، لەسەر کورسییەکەم، بەدیار قاوەیەکەوە دانیشتبووم تەماشای ئەلبوومێکی گەورەی هونەرمەندەکانی سەردەمی (بارۆک)م دەکرد؛ لەناکاو تەلەفۆنەکەی تەنیشتم زەنگی لێ دا. منیش، دووای بیرکردنەوەیەکی کورت بڕیارم دا هەڵی بگرم (نەوەک مەدام گالاتتی بێت و بیەوێ تاقیم بکاتەوە بزانێ ئاخۆ نوستووم یان بەخەبەرم؟). کاتێ دەسکی تەلەفۆنەکەم هەڵگرت، هیچ وەڵامێک نەبوو.. داخرایەوە. ئەم ڕووداوە سێیەم جاریش دووبارە بووەوە.

بەو شێوە درەنگە، لەناو بێدەنگییە سامناک و تەڕوتووشەکەدا، ڕاستییەکەی، کەوتمە نیگەرانی و کەمێکیش ترسەوە، ئەم تەلەفۆنە چی بوو؟ بۆ؟ کێ بوو؟

هەستام پاڵتۆکەم کردە سەر شانم و بەشێنەیی چوومە دەرەوە. باران، دیاربوو تازە خۆشی کردبووەوە. شەقام تەڕ بووبوو. بۆنێکی خۆش لە گەڵا و درەختی بە باران تەڕی ئەملا و ئەولای شەقامەکە هەڵدەستا. هەندێ گەڵا، شەونمەکانیان، تریفەی مانگەشەو لێی دەدان و دەبریسکانەوە.

لەناکاو، لەسەر شۆستەکەوە کاتێ سەرێکم هەڵبڕی و تەماشای سەرەوەم کرد، دیتم پیاوێک هەڵگەڕاوەتە سەر دیواری بڵندی هوتێلەکەوە. قاچی ڕاستی لەسەر گوێسوانەی ژوورێک، قاچی چەپیشی لەسەر گوێسوانەی ژوورێکی تر، دەیویست لە پەنجەرەوە بپەڕێتەوە ناو ژوورێکی هوتێلەکە.. پشتی لێم بوو.

هیچم نەکرد، هیچم نەگوت.. بەبێ خشپە چوومەوە ژوورەوە و دەرگای هوتێلەکەم بەئەسپایی داخست.

مەدام گالاتتی فێری کردبووم لەوکاتانەدا تەنیا دەست بە دوگمەیەکی سووری ژێر مێزەکەوە بنێم و تەواو!

– ئەلوو؟

– هوتێل ئەوروپا. شەقامی تغێڤیز، ژمارە (٧)، پاریسی دەیەم. دزێک لە نهۆمی دووەمی هوتێلەکەمانە، تکایە!

وابزانم پێنج دەقیقە زیاتری نەخایاند، لە پلیکانەکەی بەرامبەر منەوە، یەکەم جار ئەفسەرێک، لەدوای ئەویشەوە پۆلیسێک (کە کەلەپچەی دەستی دزەکەی لەدوای خۆیەوە گرتبوو) هێور هێور هاتنە خوارەوە، لەگەڵ دوو پۆلیسی تریش بەدوایانەوە. من سەرم سوڕمابوو چۆن ئاوها زوو گەیشتننە بەردەم من لە پێشوازییەکە:

– تۆ بووی تەلەفۆنت بۆمان کرد؟

– بەڵێ.

ئەفسەرەکە گوتی:

– ناو و ئەدرێسی خۆتمان بدێ تا سوپاسێکت بۆ بنێرین.

لەو دەمەدا زەنگی دەرگاکە لێی دا. مەدام گالاتی و مسیۆ لووسیانای کوڕی بوون بەم نیوەشەوە. کاتێ هاتنە ژوورەوە، مەدام گالاتتی، زۆر پەشۆکاو؛ مسیۆ لووسیانا لە ئەو شپرزەتر.

– گرتتان؟

ئەفسەرەکە کاتێ خاوەنەکانی هوتێلەکەی بینی وا بەپەلەپرووزێ و دڵخۆشییەوە هاتنە ژوورەوە، وەک بیەوێ خۆی لەپێش ئەوان ئازا بکا، بەتوورەییەوە لە دزەکەی پرسی:

– ناوت چییە؟

دزەکە تەماشای عەرزی دەکرد و وەڵامی نەدایەوە.

مەدام گالاتی، کە زۆر بەتوورەییەوە تەماشای دزەکەی دەکرد چونکە وەڵامی ئەفسەرەکەی نەدایەوە، بەهەڵپەوە گوتی:

– بێگومان، محەمەد!

دزەکە، گەنجێکی قژن، کەتەیەکی ئەسمەری لووت پان، پاشماوەی برینێکی قووڵ کە لە جێگەی چەقۆ دەچوو بەسەر رووومەتییەوە؛ بەوە زۆر رقی هەستا کە مەدام گالاتتی گوتی (بێگومان محەمەد). کەچی هیچی بە مەدام گالاتتی نەگوت. بەدرێژاییی رێگەی ناو رێڕەوەکە، زۆر بە رقەوە تەنیا تەماشای منی دەکرد و چاوی لە من زەق دەکردەوە، وەک ئەوەی خەتای من بووبێ کە ئەویان گرتووە.

ئەفسەرەکە رووی لە مادام گالاتتی کرد:

– جەزائیرییە.

بەم شێوەیە، دووای هەندێ قسە و باسی نێوان مادام گالاتتی و ئەفسەرەکە لەناو کافتیریاکە، دزەکەیان راپێچی دەرەوە کرد و هەموویان چوونە دەرەوە.

مسیۆ لووسیانا دووایین کەس بوو چووە دەرەوە. لە ئاوێنەکەی بەرامبەرمەوە بینیم لە زەنگی دەرگاکەی دا و گەڕایەوە لام:

– فەرهاد.!

گوتم: بەڵێ.

گوتی: دایکم لە توورەییی خۆیدا، بێ ئەوەی بزانێ دزەکە خەڵکی کوێیە،

مەزەندەی کرد کە عەرەب بێت؛ بۆیە گوتی (محەمەد).

من دەمزانی مسیۆ لووسیانا جوولەکەیە، وەستام تا قسەکانی خۆی تەواو بکا، گوتی:

– داوای لێبوردنت لێدەکەم ئەگەر دڵی جەنابتی هێشاندبێ. دیارە مەبەستی دایکم کاتێ گوتی (بێگومان محەمەد) هیچ شتێکی تر نەبووە لەوە زیاتر کە دەترسا هوتێلەکەمان ناوی بزڕێت و لەهەمان کاتدا زیانێکی گەورەش لە هوتێلەکەمان بکەوێ.

من لەو ڕۆژەوە زانیم کە مسیۆ لووسیانا، هەستی چەند ناسک، چەنێک ڕێز لە دینی (من) دەگرێ. لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئنجا سەدان کەس لەم ئەورووپایە ناویان محەمەد و عەلی و عیسا و مووسایە، دایک و باوکیان ئەم ناوانەیان لێ ناون بۆ ئەوەی پیاوی مەرد و شکۆمەندی وەک پێغەمبەرەکانیان لێ دەربچێ، کەچی ژیان و دەوڵەتانی ئیسلام لە ڕۆهەڵاتدا زۆربەی ئەو خەڵکانەی ئێمەیان.. ئەمەتا.. کردووە بە دز و پیاوکوژ و حەشیشەکێش و فڕێیان داونەتە سەر شەقامە ئاوارەکانی ئەورووپا»؛ «ئەمە پێوەندیی بە پێغەمبەرەکانەوە چیە؟».

بە مسیۆ لووسیانام گوت:

– سوپاست دەکەم.

من ئێستاش، کاتێ بیر لەو ڕووداوە دەکەمەوە، بە خۆم دەڵێم: ئەم نەریتی شەونشینییەی من، ئەو شەوە بۆ من خێری تێدا بوو؛ لەلایەکەوە وای لەو دایک و کوڕە خاوەن هوتێلە کرد متمانەم پێ بکەن.. لەلایەکی دیکەشەوە وای لە ئەوان کرد کە هەرگیز ڕێگە لەوە نەگرن (تەنانەت پێشیان خۆش بێ) من هەموو شەوێک تا بەیانی بۆ خۆم دابنیشم لە مەتبەخەکە ڕەسم بکەم و بە دنیای هونەریی خۆمەوە سەرقاڵ بم.

بەختەوەری لەوانەیە لە سڵاوێکەوە دەست پێ بکا

بەدبەختیش بەهەمان شێوە..

محەمەدی حاجی زادە، مەلایەکی خەلعی لیباس کراوی ئێرانی.. لەولاشەوە مسیۆ لووسیانا، خاوەن هوتێلێکی دەوڵەمەندی پاریس بەئەسڵ جوولەکەی پورتوگاڵی؛ چ شتێک کۆیان دەکاتەوە؟

چ شتێک وای کرد ئەم دوو پیاوە: یەکەمیان لەوپەڕی ڕۆهەڵاتەوە، ئەوەی دیکە لەوپەڕی ڕۆژئاوای دنیاوە، بەیەکتر بگەن؟

چ شتێک وای کرد یەکتر بناسن بۆئەوەی هەندێ ڕووداوی گرینگ لە ژیانیاندا ڕوو بدات و سەرجەم چارەنووس و داهاتوویان بگۆڕێ؟ هەڵبەتا بە ژیان و داهاتووی منیشەوە.

من بە ئەزموونی ژیان ئەم ڕاستییەم بۆ دەرکەوتووە؛ هەمیشە گوتوومە و دەشیڵێمەوە: هەندێ جار ناسینی مرۆڤێک –تەنیا ناسینی کەسێک – سەرجەم ژیانت دەگۆڕێ!

بێنە پێش چاوت:

لە کافتیریایەک دانیشتبیت بۆ ئەوەی قاوەیەک بخۆیتەوە و پاشان هەستیت بڕۆی؛ پیاوێک یان ژنێک لەولاتەوە دانیشتووە و تۆ لە ناکاو حەزدەکەی قسەیەک لەگەڵ ئەو کەسە بکەیت.. ئەگەر قسەکەت بکەیت و ئەو کەسە بناسیت؛ ئیتر ئەم ناسینە – هیچ دوور نییە – سەرتاسەری ژیانت بگۆڕێ!

یان لە پشووێکی هاوینەدا سەری خۆت هەڵگرتبێ و بەتەنیا چووبیتە وڵاتێکی دیکە، لەوێ، لەکاتی کڕینی دیارییەکدا کە بتەوێ لەگەڵ دەستی خۆت بیهێنیتەوە، کەسێک بناسیت...

یان لەناو شەقامێکی شەوێکی سارددا کەسێک داوای چەرخت لێ بکا بۆ ئەوەی جگەرەکەی دابگیرسێنێت، تۆش جگەرەکەی بۆ دابگیرسێنیت و ئەو پێت بڵێ «سوپاس»، تۆش ...

یان لەناو پۆلیسخانەیەکدا کە تۆ بۆ گەواهیدانێکی رووکەش چوویتە ئەوێ و بەڕێککەوت کەسێک لەوێ بێت و بێ ئەوەی مەبەستتان بووبێ بکەونە گفتوگۆ و پاشان ببن بە هاورێ...

لەم جۆرە رێککەوتە بچووک و سادانەی ژیانەوە، لەوانەیە جوانترین هاورێیەتی، سوودمەندترین پێوەندیی مرۆڤایەتییانە دروست ببێ؛ هاورێیەتییەک تا ڕادەی عەشق، تا ڕادەی ئەوەی کە چارەنووسی تۆی پێ بێتە گۆڕاندن.

بەختەوەری.. ئەمەیە ئیتر، لەوانەیە لە سڵاوێکەوە دەست پێ بکا. بەدبەختیش بەهەمان شێوە. ژیان.. ئاوهایە، لەوانەیە بە قاوە خواردنەوەیەک لەگەڵ کەسێک کە تازە دەیناسی، سەرتاپای، بێتە گۆڕاندن! من ڕووداوی لەم جۆرە گەلێک هاتوونەتە پێشمەوە.

هاوینی ساڵی پێرار بوو، جەنتایەکم بە شانی خۆمدا دادا و لە پاریسەوە بەسواری شەمەندەفەر چووم بۆ ڤینیز. لەناو شەمەندەفەرخانەی ڤینیز، سپێدەیەکی تاریک و ڕوون بوو کاتێ گەیشتم. هەرکە لە شەمەندەفەر دابەزیم، چووم بۆ توالێت. جەنتاکەم لەپشت خۆم، لەتەنیشت خۆم، تەنیا مەترێک لێمەوە دوور، لەبەردەم توالێتەکە بەجێ هێشت. کاتێ لە میزکردن بوومەوە و ئاورێکی پشتەوەم دایەوە، دیتم جەنتاکەم نەمابوو.

لەناو ڕێڕەوەی بەردەم توالێتەکە چاوم گێڕا هیچ کەسێکی لێ نەبوو. بەپەلە ڕام کردە ناو ڕێڕەوەکانی دیکەی ئەو ناوە.. ئەسڵەن هیچ کەسێکم نەدیت جەنتاکەی منی بەدەستەوە بێت.

تومەز دزێکی کارامە داوی نابووەوە بۆ ئەو کەسانەی تازە لە شەمەندەفەری پاریسەوە دەگەنە ناو وێستگەی ڤینیز. تەنیا لە ماوەی یەک چرکەدا (لەو

ماوەیەی کە من لە توالێتەکە بووم)، جەنتاکەی منی دەست دابوویە و تێی تەقاندبوو.

هێندەی گەڕام و سووڕام بەدەوری خۆمدا، لەناو وێستگەی شەمەندەفەرەکەدا.. نەمدۆزییەوە.

هەر هەموو پارە و پووڵم، ناسنامەکەم، پەساپۆرتەکەم، کارتی بانکەکەم، ڤۆڵدەری تابلۆکانم، تەنانەت پاکەتی جگەرە و چەرخ و جلوبەرگەکانیشم.. هەر هەمووی لەناو جەنتاکەم بوون. تەنانەت یەک قەڵەمیشم پێ نەبوو، پارەی قاوەیەکیش!

چی بکەم؟

چوومە پۆلیسخانەی ناو وێستگەی شەمەندەفەری ڤینیز، چوومە پۆلیسخانەیەکی دەرەوەی وێستگەکە، پاشان چوومە سەنتەرێکی گشتیی پۆلیس و سکاڵام کرد. هیچ سوودی نەبوو. ئەفسەرەکە بە لالووتییەکی بێباکانەوە گوتی:

– بچۆرە سەفارەتخانەی فەرەنسی لە ڤینیز، تەنیا ئەوان دەتوانن یارمەتیت بدەن.

ئەو ڕۆژە بەرەبەیانی ڕۆژی شەممە بوو. ڕۆژی شەممە و یەکشەممە پشووی فەرمی بوو. دەبووایە دوو ڕۆژ – تا ڕۆژی دووشەممە– لە جادان بنووم؛ بێ ماڵ و حاڵ، بەبرسێتی، بێ جگەرە، بێ نان و ئاو، لە شەقامان بسووڕێمەوە: ئاخۆ چ ڕۆژێک لەدووای دووشەممەوە سەفارەتخانەی فەرەنسی لە ڤینیز دەکرێتەوە؟

دوو برادەری کوردم لە ڤینیز هەبوو، بەڵام ژمارەی تەلەفۆنەکانیانم لەبەر نەبوو، ژمارەی تەلەفۆنەکانیان لەناو دەفتەرە بچکۆڵەکەم کە ئەویش هەر لەناو جەنتا گەورەکەمدا بوو. تەنیا ژمارەی تەلەفۆنی یەک برادەرمم دەزانی، ژمارەی تەلەفۆنی (ئازاد نانەکەلی)ی نیگارکێش لە فلۆرەنسا. دڵنیام ئەگەر تەلەفۆنێکم بۆی بکردایە، بەهەرچی شێوەیەک بووایە، لە فلۆرەنساوە دەیتوانی

فریام بکەوێت یان چارەسەرێکی بەپەلەی بۆم دەدۆزییەوە. دڵنیابووم.

زیاتر لە پێنج شەش جار، داوام لە پێنج شەش خاوەنی کافتریاکان کرد:

– مسیۆ.. تکا دەکەم تەنیا چەند لیرەیەکم بەقەرز بدەیتێ تا تەلەفۆنێک بۆ هاورێیەکم دەکەم لە فلۆرەنسا بۆ ئەوەی فریام بکەوێ.

چوومە ناو دوکانی جگەرەفرۆشەکانی سەر رێگەکانیش. چوومە ناو دوکانی سەموونفرۆشەکانیش. خەریک بوو بچمە ناو کەنیسەیەکیشەوە.. بەڵام دیتم لەبەردەم کەنیسەکەدا تەنیا سواڵکەرێکی کلۆڵ دانیشتبوو؛ پەشیمان بوومەوە. هیچ کەسێک لە ڤینیز ئامادەیی ئەوەی نەبوو تەنانەت تەنیا یەک لیرەشم بەقەرز بداتێ.

تا نیوەڕۆ دانم بەخۆمدا گرت، بەڵام لە پاش نیوەڕۆ بەملاوە، برسێتی هێندە نا، بەڵام بێ جگەرەیی بەتەواوەتی تەنگی پێ هەڵچنیبووم. قوونکە جگەرەم لە عەرز هەڵدەگرتەوە بۆئەوەی پاشان داوای ئاگر لە گەنجێکی سەر رێگە بکەم بۆ ئەوەی دای بگیرسێنم.

خەریک بوو دنیا تاریک دادەهات. دڵم کەوتە ختوورەوە و بیرم کردەوە. ئەمشەو لە کوێ بنووم؟ ئاخۆ بەرگەی برسێتی دەگرم تا بەیانی؟ ئەی سبەینێ؟ چ بکەم؟ ئەم پرسیارانە، بەتایبەتیش رقم لەو دزەی کە جەنتاکەی دزیبووم، زۆر تووڕەی کردبووم.

لەناکاو دیسان چوومەوە ناو هەمان سەنتەری پۆلیسی گشتی کە پێشتر چووبووم بۆ لایان. دیسان کەوتمەوە شکایەتکردن. دیسان ئەفسەرەکە گوتی:

– پێم گوتی «تاقە چارەسەرێک ئەوەیە کە بچیتە سەفارەتخانەی فەرەنسا لە ڤینیز، تەنیا ئەوان دەتوانن یارمەتیت بدەن».

گوتم: مسیۆ.. ئەمڕۆ شەممەیە، سەفارەتخانەی فەرەنسی هەتا رۆژی دووشەممە ناکرێتەوە.

ئەفسەرەکە ئاخێزی بێباکیی نوواند بەرامبەرم.

– پاشان من تەنیا داوای یارمەتییەکی بچووکتان لێ دەکەم. تەنیا چەند لیرەیەکم بە قەرز بدەنێ، سبەی دەتاندەمەوە.

ئەفسەرەکە دیسان ئاخێزی بێباکیی نواند بەرامبەرم.

من خۆم پێ ڕانەگیرا، هاوارم کردە ناو قوولاییی پۆلیسخانەکە، بەشێوەیەک کە هەر هەموو پۆلیس و ئەفسەر و فەرمانبەرەکان زەندەقیان چوو.

– من میوانم، لە پاریسەوە هاتوومەتە ولاتی ئێوە، ئەی ئیتالیاییەکانی ڕێنسانس!

هەر هەموو پۆلیس و ئەفسەر و فەرمانبەرەکان لەناو پۆلیسخانەکەدا، وایان دەزانی تیرۆریستم و خەریکم شتێک دەکەم، گوێیان لێم ڕاگرتبوو. من بە دەنگێکی بەرزتر درێژەم بە هاوارکردنەکەم دا:

– ئیتالییەک لە خوێن و گۆشت و نەژادی ئێوە، دزیی لە من کردووە. هەموو پارە و پووڵ و کارتی بانک و پەساپۆرت و تەنانەت پاکەت و چەرخ و دەرپێ قوتە و جلوبەرگەکانیشمی دزیوە.. کەچی ئەم ئیتالیا گەورەیە، شەهامەتی ئەوەی نییە لەبەرامبەر ئەم هەڵوێستە ناشیرینەی خۆیدا، تەنیا چەند لیرەیەکم تا سبەینێ بە قەرز بداتێ!

من دەمزانی ئەفسەرەکە، هەموو پۆلیس و فەرمانبەرەکانیش، هەموو ئەو کەسانەی دیکەش کە لەوێ شکایەتنامەیان هەبوو، فەرەنسی تێ دەگەیشتن.

بە هەمان تووڕەیی و دەنگی بەرز گوتم:

– حکوومەتی ئیتالیا لەم تاوانە گەورەیەی دەرهەق بە من کراوە، بەرپرسە! من کوردم بەڵام پەساپۆرتی فەرەنسیم پێیە، لەم شارەی ئێوە ئیتالییەک دزیی لە من کردووە. هیچ ئیتالییەکی بەشەرەف لەم ولاتەدا نییە، ویژدانی بەم قسانەی من بجووڵێت؟

هەموویان بێدەنگ گوێیان لەم هاتوهاوارەم ڕاگرتبوو.

– ئەمە چ ولاتێکە کە دزی لە بێگانە و تووریستان بکات و هیچ کەسێکێش نەبێ ویژدانی بجووڵێت و یارمەتییەکت بدا؟

سەرجەم پۆلیسخانەکە، بە فەرمانبەر و پۆلیس و بە خەڵکەکەی ناویشیەوە تەماشای دەمی منیان دەکرد. ڕووم کردەوە ئەفسەرەکە:

– من تەنیا داوای چەند لیرەیەکتان لێ دەکەم بە قەرز، بۆئەوەی تەلەفۆنێک بۆ برادەرێکم بکەم لە فلۆرەنسا بۆ ئەوەی فریام بکەوێ.

هیچ کەسێک، دیسان، هیچ نوتقێکی لە دەم نەهاتە دەرەوە.

لەناکاو، لەولاوە پیاوێکی کۆک و جەنتڵمان هاتە لام و بە چرپە لێی پرسیم:

– دەتوانین لە دەرەوە قاوەیەک پێکەوە بخۆینەوە؟

من قوڕگم وشک وشک بووبوو. برسیشم بوو، گوتم:

– سوپاست دەکەم.

کە لە قاوەخانەکە دانیشتین، کابرای جەنتڵمان پێی گوتم:

– لەناو قسەکانتدا گوێم لێ بوو گوتت کە کوردیت و لە پاریس دەژیت.

– بەڵێ، ئا.

بە گارسۆنەکەی گوت: سێ قاوە.

پێش ئەوەی گارسۆنەکە بڕوا، لە کابرام پرسی:

– دەکرێ لە جیاتی قاوە تەنیا جگەرەیەکت لێ داوا بکەم؟

بە گارسۆنەکەی گوت:

– سێ قاوە و پاکەتێک جگەرەش، تکایە!

ئنجا دەستی بۆ ژنێک درێژ کرد کە ئەویش هەر لە پۆلیسخانەکەوە تا ناو قاوخانەکە لەگەڵمان هاتبوو، بەرامبەرم دانیشتبوو:

– ئەم خاتوونە خوشکی منە، ئەویش دوێنی شەو ماڵەکەی دزراوە.

– ئێمەش هاتووین سکاڵا بکەین.

ژنەکە لەتەنیشت خۆی دانیشتبوو، غەمگین.

– خۆشحاڵم بە ناسینتان.

کابرای جەنتڵمان گوتی:

– من ناوم بێرناردۆ فێرارییە.

کارتەکەی خۆی دایە دەستم. (من درەنگتر زانیم کە بنەماڵەی فێراری یەکێکە لە بنەماڵە دەوڵەمەندەکانی ئیتاڵیا کە کۆمپانیای ئۆتومبێلی فێراریش هەر بەناوی ئەوانەوە کراوە).

– کاتی خۆی، لە سەرەتای ساڵانی حەفتا، من ئەندازیار بووم، هاتمە کوردستان، لە ناوچەکانی دەوروبەری دهۆک پرۆژەیەکی ئەندازیاریمان هەبوو. نۆ مانگ لە کوردستان، لە ناوچەکانی دەوروبەری دهۆک کارم کردووە.

ئنجا گوتی:

– من دەزانم کورد چەنێک میواندۆستن، کورد زۆر خزمەتی منیان کردووە لە کوردستان. من خۆم بە قەرداری کوردان دەزانم. ئەمرۆ کە تۆم بینی لەناو وڵاتی خۆمدا دزیت لێ کراوە، شەرمم لەخۆم کردەوە و زۆر نیگەران بووم. تۆ ویژدانی منت بریندار کرد.

من ویستم بە مسیۆ فێراری بڵێم:

– من تەنیا چەند لیرەیەکم بەقەرز دەوێت، بەڵێن بێ؛ سبەینێ دەتاندەمەوە.

بواری نەدام قسەکەم تەواو بکەم:

– ئەمرۆ بە باشترین دەرفەتی دەزانم کە بتوانم پاداشتی چاکەی کورد بدەمەوە. چونکە لە وڵاتی خۆتان، ئێوەی کورد زۆر یارمەتیی منتان داوە. ئەو کاتەی ئەندازیار بووم لە ساڵی ١٩٧١ بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەیەک هاتبووینە شاری دهۆک.

ویستم پێی بڵێم:

– برادەرێکم لە فلۆرەنسا هەیە، ئەگەر بتوانم تەلەفۆنێکی بۆ بکەم، دێتە لام و لەگەڵ خۆی دەمبا، یا لەوانەیە پارەیەکم بۆ بنێرێ، یان...

دیسان بواری نەدام قسەکەم تەواو بکەم، جەنتای پارەکەی لە باخەڵی

دەرهێنا و کەوتە پارە ژماردن. ئنجا سەفتەیەک پارەی کاغەزی لەپێشم دانا:

– ئەمە پارەی پێنج شەوی هوتێلت.

گوتم: مسیۆ!

مسیۆ فێراری سەفتەیەکی ئەستوورتریشی دانایە سەر مێزەکە:

– ئەمەش پارەی جگەرە و خواردنەوە و نانخواردنی پێنج ڕۆژی داهاتووت.. تا ئەو کاتەی فریای سەفارەتخانەی فەرەنسی دەکەویت، سێ سبەی.

ئنجا گوتی:

– چونکە سەفارەتخانەی فەرەنسی، من دەزانم تەنیا سێ شەمووان و پێنج شەمووان کراوەیە.

من سەرم سوڕما بوو، گوتم: مسیۆ.. تکا دەکەم.

بێرناردۆ فێراری دیسان بواری نەدام قسەم تەواو بکەم، سەفتەیەکی دیکەیشی دانایە سەر مێزەکە:

– ئەمەش پارەی کارتێکی تەلەفۆن.

وتم: «مسیۆ..»؛ دەمویست پێی بڵێم: «من تەنیا چەند لیرەیەکم بەقەرز دەوێت بۆئەوەی تەنیا...».

دیسان بواری نەدام قسەم تەواو بکەم:

– ئەگەر هەڵی نەگریت، هەتا ماوم جنێو بە کورد دەدەم!

مسیۆ فێراری پێ کەنی:

– هەڵی گرە!

ڕووی لە خوشکەکەی کرد و زەردەخەنەیەکی بۆ کرد. تەنیا یەک قومی لە قاوەکەی دا و هەستایەوە. خوشکەکەیشی هەستایەوە.

مسیۆ فێراری، پێش ئەوەی بڕوا گوتی:

– بەختێکی باشت بۆ دەخوازم لە ژیاندا.

منیش هەستامەوە، بەهەڵەداوان و حەپەساو، کارتەکەی ئەوم بەدەستەوە وشک، تەماشای ئەو هەموو پارەیەی سەر مێزەکەم دەکرد.

بێرناردۆ فێراری دەستی تەوقەی بەردام و گوتی:

– خوات لەگەڵ.

لەلای دەرگاکەشەوە ئاوڕێکی دایەوە:

– پارەی جگەرە و قاوەکانمان خۆت بیدە!

دەستێکی ڕاوەشاند و زەردەخەنەیەکی بۆم کرد.

من لەناو قاوەخانەکە دانیشتمەوە و خەریکی لێک جوداکردنەوەی سەفتەی پارەکان و ڕێکخستنیان بووم، لەناکاو دیتم مسیۆ فێراری دیسان بەپەلە هاتە ژوورەوە و گوتی:

– حەزم کرد قسەیەکی تریش بە جەنابت بڵێم!

– بەڵێ.

مسیۆ فێراری، زۆر بە شانازیکردن بە ئیتاڵیای وڵاتی خۆیەوە، بە لاچاوێکەوە گوتی:

– مەرجیش نییە ئەو کەسەی جەنتاکەتی دزیوە ئیتاڵی بێ! چونکە ئەم شارەی ئێمە پڕە لە پەناهەندە و خەڵکی بێگانە. خۆشت دەزانی.

ئەم قسەیەی کرد و بە هەنگاوی گەورە و خێرا گەیشتەوە دەرگا، بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە، ئاوا بوو. بەم قسەیەی مسیۆ فێراری هەرگیز نیگەران نەبووم، بەڵام ئەوەم پێ ناخۆش بوو کە لەبیرم کرد پێی بڵێم: «سوپاس».

من هەرگیز ئەم ڕووداوە بچووکە لەبیر ناکەم کە سەرجەم ژیانی منی گۆڕی و منی لە مەینەتییەکی زۆر ناخۆش (لە شارێکدا کە هیچ کەسێکم تێدا نەدەناسی) ڕزگار کرد.

ئەم ڕووداوە بچووکە، واتە ڕزگاربوونی من لەدەست ئەو مەینەتەی ئەو ڕۆژە، تەنیا بەهۆی ئەمەوە بوو کە لەو ساتەی لەناو پۆلیسخانەکەدا دەنگی

خۆمم هەڵبڕی، بەرێککەوت مسیۆ فێراری لەوێ بوو.

ئەگەر من لەو کاتەدا مسیۆ فێراریم لەناو ئەو پۆلیسخانەیەدا نەناسیبا، یان ئەگەر مسیۆ فێراری لەناو پۆلیسخانەکەدا نەبوایە، یان ئەگەر من تووڕە نەبوومایە و بەدەنگی بەرز ئەو قسانەم نەکردایە.. کێ دەیزانی ژیانی من بە چی دەگەیشت؟ ئایا چ شتێکی جیاوازم بەسەر دەهات؟ چی ڕووی دەدا؟ کەس نازانێ.

یەکترناسینی من و محەمەدی حاجی زادە و مسیۆ لووسیانای خاوەن هوتێلەکەش، بە هەمان شێوە، یەکێکە لەو ڕووداوە بچووکانەی کە هەمان باندەستیان بەسەر ژیانی منەوە هەیە؛ هەروەها بەسەر ژیانی محەمەدی حاجی زادە و مسیۆ لووسیاناشەوە. چونکە ئەگەر من محەمەدی حاجی زادەم نەناسیایە، مسیۆ لوسیاناش محەمەدی حاجی زادەی نەدەناسی، لەو کاتەدا ڕوئیا خانمیش تووشی کەوتنی دڵ نەدەهات، لە هەمان کاتدا منیش ساقی گوڵچینم هەرگیز نەدەناسی. بەکورتی: هیچ یەکێک لە شتەکان بەو شێوەیە ڕوویان نەدەدا کە ڕوویان دا و ئێستا هەن، هیچ کەسێکیش (من و ساقی گوڵچین و مسیۆ لووسیانا و ڕوئیا خانم و محەمەدی حاجی زادە و ئەوانی دیکەش..) هیچ کەسێک ئەو شتانەیان بەسەر نەدەهات کە بەسەریان هات.

لەو کاتەشدا شتی دیکە ڕوویان دەدا و کەسەکانیش شتی دیکەیان بەسەر دەهات: بەڵام هەرگیز ئەو شتانە نا کە ڕوویان دا و بەسەریاندا هات.

کەواتە، هەمیشە تاقە ڕووداوێکی بچووک دەبێتە شاڕێگە بەرەو هەموو ڕووداوەکانی تر کە لە داهاتوودا بەسەرمان دێن. هەمیشە تاقە ڕووداوێکی بچووک هەیە چارەنووسمان دەسنیشان دەکا. بۆیە ئێمە، هەموومان، هەمیشە بە خۆمان دەڵێین: «ئەگەر ئەو ڕووداوە ئاساییە ڕووی نەدابایە، ئەو هەموو ڕووداوەی تر هەرگیز بەسەرماندا نەدەهاتن».

هیچ کەسێک نییە ئەم قسەیەی ڕۆژێک لە ڕۆژان بە خۆی نەگوتبێ!

هەموو ڕووداوێک ڕێگایەکە بۆ گەیشتن بە ڕووداوێکی دیکە.

هەموو ڕووداوێک

تا کاتی خۆی نەیەت ڕوو نادا

مسیۆ لووسیانا و محەمەدی حاجی زادە، من بەیەکترم ناساندن.

بە محەمەدی حاجی زادەم گوتبوو:

– ئەگەر چاوت بە مسیۆ لووسیانای خاوەن هوتێلەکەم بکەوێ، واقت وڕ دەمێنێ، وادەزانی خۆت دەبینی: هەمان سەر و سیماتان هەیە.. تەنانەت قەد و باڵاشتان هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە. ئێمەی کورد دەڵێین «سێوێکن و کراون بە دوو لەتەوە».

هەمان ئەم قسەیەم (چەندین جار) بە مسیۆ لووسیاناش گوتبوو.

گوتبووم:

– ئەگەر چاوت بەم محەمەدی حاجی زادەیە بکەوێ، واقت وڕ دەمێنێ، وادەزانی خۆت دەبینی: هەمان سەر و سیما.. تەنانەت قەد و باڵاشتان هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە. ئێمەی کورد دەڵێین «سێوێکن و کراون بە دوو لەتەوە».

من، هێندە کونجکۆڵ بووم، خۆم ڕانەدەگرت: چۆن ئەم دوو پیاوە (یەکێکیان مەلایەکی ئێرانی، ئەوی تر خاوەن هوتێلێکی جوولەکەی پاریس- بەئەسڵ پورتوگاڵی) هێندە لەیەکتر دەچن!

زیاتر لە سێ- چوار جار ئەم سەرسامییەی خۆمم لەهەمبەر لەیەکچوونی ئەم دوو پیاوە ئێرانی و پۆرتوگاڵییە، لای هەر یەکێکیان باس کردبوو.

هەر جارێکیش دەرکم بە لێکچوونی ئاخێزێکی دیکەیان کردبا، یان هەر

جــــارێک بۆم دەرکـــەوتبـــا کـــە -بۆ نموونە- تەنانەت چۆنیـــەتیی ددان پاککردنەوەشیان هەر لە یەکتر دەچێ، خۆم پێ ڕانەدەگیرا، دەمگوت «ماشا ئەڵڵا...». کـەچی ئـەوان، هـەردووکیـان، هیچ کـاردنەوەیەکی ئەوتۆیان نـەبوو، تەنیا بە زەردەخەنەیەک وەڵامیان دەدامەوە و هیچی تر.

نە مـحـەمـەدی حاجی زادە، نە مـسـیۆ لووسیانا، هـیچ ڕۆژێک، هیچ مگێز و مەرەقی ئەوەیان لەلا دروست نەبووبوو کە داوام لێ بکەن بەیەکتریان بناسێنم.

وا پێ دەچێ، هەموو ڕووداوێک، تا کاتی خۆی نەیەت، ڕوو نادا!

## پاراستنی کولتووری ئیسلام و ئەخلاقی ئیسلامی
## لە نوێژ و ڕۆژوو زۆر گرینگترە.

ئەو کـاتـەی مـحـەمـەدی حـاجی زادەم نـاسی، تازە لە یۆنانـەوە لەڕێگەی کەشـتییەکانی بەرەو ئیتاڵیا بە قاچاغ خۆی کردبووە ناو خاکی فەرەنساوە.. دەیگوت «چەند هەفتەیەکە داوای مافی پەناهەندەییم کردووە».

لە مۆنتماخت، ئێوارەیەکی ڕۆژی یەکشەممە، لەناو نیگارکێشە ئەرجەنتینی و چینی و یۆنانی و کووباییەکاندا، ستاند و بۆردەکەی (لیباردۆ)ی هاوڕێمم وەرگـرتبـوو (لیـبـاردۆ خـۆی و ژنە سـوێدییـەکـەی چووبوونە سـتـۆکـهـۆڵم بۆ سـەردانی مـاڵە خـەزوورانی؛ مـنیش جێگەکـەی ئەوم گرتبـووەوە بۆ ئەوەی –تا ئەو دەگـەڕێتـەوە– بۆ خـۆم هەندێک پارە بە پۆرترێت کێـشـانەوە پەیدا بکەم). ڕاوەسـتـابووم پۆرترێتی پیاوێکی کۆک و جـەنتڵـمەنم دروست دەکـرد. پیاوە جـەنتڵـمەنەکە زۆر دەوڵەمـەند دیار بوو، دەیگوت کە پرۆفیسـۆرە لە یەکێک لە زانکۆکانی مەکەی موکەڕەمە.

ئادگاری ئەو پرۆفیسـۆرە سـعوودییە لە ئیـمامی عەلی دەچوو، ئەو ئیـمامی عـەلییـەی کە من لە زەمـانی منداڵیـمدا بەسـەر دیواری مـاڵ و چایخـانەکانەوە دیبـووم و وێنەکەی لە خـەیاڵمدا مـابوو: ڕیشن، چاو و برۆ ڕەش، دەمـوچاوێکی گەش، قڵنجێک بەدەستیەوە، چوارمشقی.. شێرێک لەبەردەمی وەرکەوتبوو.

لەو دەمەی خەریکی وێنەکێشانی ئەو پرۆفیسۆرە عارەبە سعوودییە بووم کە لە ئیمامی عەلی دەچوو، دەنگێکی فارسی لەپشت سەرمەوە بەئەسپایی گوتی:

– چ جالب!

کـاتـێ ئاوڕم دایەوە و چاوم بە ڕوخـسـارەکـە کـەوت (سـەرەڕای زمـانە

فارسییەکە) وام زانی خاوەنی ئەو دەنگ و ڕوخسارە مسیۆ لووسیانای خاوەن هوتێلەکەمە.

پێم خۆش بوو کە مسیۆ لووسیانای خاوەن هوتێلەکەم هاتووە بۆ مۆنتماخت، یەکسەر ویستم پاڵێتەکە دانێم و بەخێرهاتنی بکەم:

- سەڤا.. مسیۆ لووسیانا؟

کە تەماشام کرد، وەک چۆن لە خەونێکدا وێنەی دوو کەس لەپێش چاوتدا تێکەڵ بەیەکتر دەبن؛ تووشی حاڵەتێکی سەرلێشێوانی زۆر سەیر هاتم. تەنانەت لە چرکەیەکدا لە خۆمم پرسی «من ئەم پیاوەم لە کوێ دیوە؟ ئەوە من لە کوێم؟».

زۆری پێ نەچوو هاتمەوە هۆش خۆم و زانیم ئەم پیاوەی بەردەمم، مسیۆ لووسیانای خاوەن هوتێلەکەم نییە.

محەمەدی حاجی زادە بوو!

هەمان قەڵافەت و سەروسیمای مسیۆ لووسیانا، قەمسەڵەیەکی کەشخە لەبەر، ڕاوەستابوو تەماشای پۆرترێتەکەمی دەکرد.

دووای ئەوەی کە تەواو دڵنیا بووم ئەمە مسیۆ لووسیانای خاوەن هوتێلەکەم نییە، لە مێشکی خۆمدا کەوتمە بەراوردکردنیان.

تاقە جیاوازییەک لەنێوان مسیۆ لووسیانای خاوەن هوتێلەکەم و محەمەدی حاجی زادە بەدیم دەکرد تەنیا ئەمە بوو کە محەمەدی حاجی زادە ئەو ڕۆژە قەمسەڵەیەکی لەبەر بوو، لەکاتێکدا مسیۆ لووسیانا بەدرێژاییی ژیانی، هەرگیز نەمبینیبوو قەمسەڵە بکاتە بەر.

دیار بوو محەمەدی حاجی زادە هەرگیز چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد من فارسی بزانم؛ لە وەڵامی حەپەسانەکەی مندا، بە زەردەخەنەیەکی پڕ خۆشحاڵی و لە هەمان کاتدا بە سەرسامییەوە پرسی:

- ای.. اقا.. شما ایرانی هستید؟

گوتم کە نەخێر کوردی عیراقم.

ئاوها بوو کە من محەمەدی حاجی زادەم لە پاریس ناسی.

لەناو قاوەخانەکەی مۆنتماخت، لە یەکەمین قسەدا محەمەدی حاجی زادە پێی گوتم: «ئێمەی ئێرانی، بڕوامان وایە کورد لە نەتەوە ڕەسەنەکانی ئێرانن».

پاشان، هەر لەوێ، لەناو قاوەخانەکەی مۆنتماخت کەوتینە باسکردنی زۆر شت. باس و خواسی ئەو هەموو هەزاران سەربازە بێ گوناحەی لە وڵاتەکەی من و لە وڵاتەکەی ئەودا، بەبێ هۆ و بەبێ هیچ تاوانێک بوونەتە خۆراکی ئاگری ئەو شەڕە دەبەنگەی خومەینی و سەدام بەسەر هەر دوو وڵاتەکەی ئێمەدا سەپاندوویانە؛ چۆنیش بەناوی دینەوە ئەم هەموو خەڵکە موسڵمانەی دوو وڵاتەکەمان لەناو سەنگەرەکانی سەر سنووردا بەربوونەتە گیانی یەکتر؛ گرانی و بێکاری لەناو شارەکانماندا؛ زەندەقچوونی ئینسان و بێزاریی خەڵک لەناو شاران؛ قاچاغچییەکانی سەر سنوور کە چۆن بەردەوام بەکۆمەڵ ئاوارە و ڕاکردووەکانی دەست سەربازی بە نرخێکی زۆر گران لە ئێرانەوە بە قاچاغ دەگەیەننە عێراق و لە عێراقیشەوە دەیانگەیەنن بە ئێران.. یان بە تورکیا.

هەر کاتێک بابەتێک تەواو دەبوو، محەمەدی حاجی زادە بە داخ و نیگەرانییەوە، بابەتێکی تری بۆ قسەکردن دەدۆزییەوە و قسەمان لەسەر دەکرد.

بەسەرهاتەکانی ئەو هەموو پێشمەرگە و مەلا و ڕووناکبیرە دڵسۆزانەی کوردستانی ئێران کە ئایەتوڵڵا خەلخالی لە سەرەتای شۆڕشی ئێراندا تەفروتوونای کردن و بەکوشتن دان لەپێناو بەتەواوەتی سڕینەوەی خەباتی نەتەوەیی کورد لە ئێراندا؛ قەدەغەکردنی زمانی کوردی و کولتووری کوردی لە سەرانسەری ئێران؛ بەزۆر حیجابکردنی ژنان؛ قەدەغەکردنی گۆرانی و مۆسیقا؛ سانسۆرکردنی ڕەهای فیلم و چاپەمەنی؛ بڵاوکردنەوەی بەئانقەستی حەشیشە و تریاک بەناو گەنجاندا؛ ناردنی چەک و تەقەمەنی بۆ چەکدارەکانی حزبوڵڵا لە لوبنان و بۆ تاڵیبان لە ئەفغانستان؛ نەتوانینی سەفەرکردن بەرەو

دەرەوەی ئێران و دەرەوەی عێراق لەلایەن سەرجەم خەڵکەوە بەهۆی ئەوەی کە هەر دوو دەوڵەتەکە بە هیچ شێوەیەک چیتر ڕێگە نادەنە هاوڵاتییەکانی خۆیان پەساپۆرت دەربکەن.

پاشانیش محەمەدی حاجی زادە بەخەفەتێکی زۆرەوە باسی ئەوەی بۆ گێرامەوە کە برادەرێکی نزیکی ئەو، وەختی خۆی لە شاری (زنجان) مەلایەکی زۆر ناودار بووە و لە حەوزەی عیلمیدا پایەیەکی بەرزیشی هەبووە بەڵام تەنیا چونکە لایەنگیری باڵی (منتظری) بووە، ئاخوندەکانی ڕژێم ویستوویانە بیگرن و لەداری بدەن، بۆیە ئێستا ئەمرۆ -لەدەست ڕژێم - ڕای کردووەتە کەنەدا و لە شارۆچکەیەکی باشووری ئەوێ، ناچار، بە یارمەتیی کەنیسەیەکی ئەو مسیۆنێرانە دەژی کە باوەشی بۆ دوورخراوە سیاسییەکانی جیهانی سێیەم کردووەتەوە.

ئنجا لە کۆتاییدا محەمەدی حاجی زادە بەرامبەر بەم حاڵەتەی برادەرە زنجانییەکەی، کە دەیگوت لەدەست زەبروزەنگی کۆماری ئیسلامیی ئێران ڕای کردووە، نیگەرانییەکی زۆری دەربڕی و گوتی:

- ئەم بەدبەختی و ڕیسواییەی ئەمڕۆ بەهۆی کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە بەسەر خەڵکی موسڵمانی ئێران و بەسەر دینی ئیسلامدا هاتووە، ئەوپەڕی ئیهانەیە بۆ دینی پیرۆزی ئیسلام.

ئەم هەموو قسە و باسانە.. کەچی محەمەدی حاجی زادە لەو یەکەمین ئێوارەیەدا ئەوەی لێم شاردەوە کە ئەو خۆیشی، کاتی خۆی، لە تاران، بەدرێژاییی چەندین ساڵ مەلا بووە و خەلعی لیباس کراوە بۆیە ڕای کردووەتە پاریس!

ئنجا لە کۆتاییدا و هەر لە ناو قسەکانماندا داوامی لێ کرد کە ئەگەر دەکرێت کارێکی بۆ بدۆزمەوە بۆ ئەوەی بتوانێ بژیویی خۆی پێ مەیسەر بکات و لە پاریس بێکار نەمێنێتەوە.

لێم پرسی: چ کارێک؟

گوتی: هەر کارێک.

محەمەدی حاجی زادە ئەو کاتە لە گەڕەکی (ئەرجەنتۆی)، کە دەیگوت ژن و مێردێکی ئێرانیی ناسیاو لە ماڵەکەی خۆیان جێگەیان بۆی کردووەتەوە، دەژیا. دەیگوت: «بە ئەوانیشم گوتووە».

من خۆم دەعوەتی محەمەدی حاجی زادەم کردبووە کۆنتواری قاوەخانەکە؛ چونکە ڕاستییەکەی، هەمیشە ئێرانییەکان بە نزیکی ڕۆحی خۆم دەزانم و خۆشم دەوێن. هەر لەم یەکەمین دیمانەیەشدا بوو پێم گوت کە سەروسیمای، چەندێک لە سەر و سیمای مسیۆ لووسیانای خاوەنی هوتێلەکەم دەچێ!

لەئاست ئەم قسەیەمدا، زەردەخەنەیەکی کرد و سەرێکی بادا.. وابزانم بۆ مجامەلەکردن بوو، گوتی:

– ڕاست دەکەی؛ منیش ڕۆژێک بە ژاپۆنییەکم گوت «ئێوە هەمووتان بەیەکتر دەچن»، کەچی ئەو ژاپۆنییە پێم پێ کەنی و گوتی: «نەخێر؛ (ئێوە) لەپێش چاوی ئێمە هەمووتان بەیەکتر دەچن».

من بیرەیەک، محەمەدی حاجی زادەش قاوەیەکی لەبەردەمدا بوو.

– ژن و مێردەکە هەردووکیان شاعیرن. زۆر حەزیشیان لە مووزیکی ئەسیڵی ئێرانی و تابلۆ و ئەم جۆرە شتانەیە.

باسی ئەو ژن و مێردە ئێرانییەی دەکرد کە لەلایان دەژی: مورتەزای گوڵچین و فەرەحناز خانم.

– بۆچی ڕۆژێک پێکەوە دانەنیشین؟

محەمەدی حاجی زادە بەرامبەر بەوەی کە دەعوەتی ئەم قاوەیەخانەیەم کردبوو، زۆر دڵخۆش و مننەتبارانە لوتفی خۆی دەردەبڕی.

– حەتمەن ئەگەر نیگارکێشێکی کوردی وەک جەنابت بناسن.. زۆر کەیفیان دێ. ئەوانیش هەر تەنیا شەش مانگە مافی پەناهەندەییان لێرە بۆ دەرچووە.

حەزیدەکرد دەعوەتی ماڵی ئەو ژن و مێردە ئێرانییەم بکا:

- چ دەڵێی؟

من دەمزانی، هەموو ئەو کورد و عەرەب و تورک و ئێرانییانەی تازە دەبنە پەناهەندە و هێشتا لەناو فەرەنسییەکاندا بەتەواوەتی خەڵک ناناسن و بە ژیانی نوێی ئەوروپا ڕانەهاتوون، زۆر مگێزی ئەوەیان هەیە یەکتر بناسن و لەگەڵ یەکتر کۆببنەوە و (گەڕەکێکی بچووک) لە هاوجۆری خۆیان دروست بکەن-ئنجا ئەگەر عەرەب بن یان تورک، ئازەری بن یان فارس، کورد بن یان بلووچ - نۆستالجیایەکی زۆر قووڵ و پڕ سوێ، کە لەبنەڕەتدا مەسەلەیەکی تەواو دەروونییە و پێوەندیی بە لاوازیی ویستی مرۆڤی ڕۆهەڵاتییەوە هەیە، وایان لێ دەکا مەسەلەی هاودینی بکەنە پاساوی ئەم لەیەکتر گردبوونەوەیان، وایان لێ دەکا دین بکەنە هەنجەت بۆ ئەم لاوازی و نەتوانینەی خۆیان لەوەی تێکەڵ بە ئەوروپاییەکان ببن. بۆیە دێن بە دەوری ئیسلامدا، بەدەوری سۆزی غەریبیی یەکتردا کۆدەبنەوە.. ئیتر هێدی هێدی، قۆناغ بە قۆناغ لە کۆتاییدا دەبنە (سەنگەرێک) دژی ئەورووپا.

- ئەمە زۆر مەترسیدارە.

مورتەزا (کە بەناوی مورتەزای گوڵچین خۆی پێ ناساندم)، هاوڕێی محەمەدی حاجی زادە، پیاوێکی سی ساڵە، کە دەیگوت لەگەڵ فەرەحنازی خێزانەکەی، دوکانێکی فۆتۆکۆپییان لە نزیک باغی لووکزەمبوورگ هەیە، حەپەساو، لێمی پرسی:

- بۆچی مەترسیدارە؟

فەرەحناز خانم، خێزانی مورتەزا، کە دەیگوت چەند مانگێکە برا گەورەکەی لە شەڕی قەسری شیرین بە بۆمبابارانی عیراقییەکان شەهیدکراوە، بەهەمان شێوە، بەڵام بە ئاوازێکی سەرسوڕماوتر، گوتی:

- بۆ؟

گوتم: چونکە ئەمە وا لە ئێمەی پەناهەندە دەکا هەرگیز نەتوانین بچینە ناو فەرەنساییەکانەوە و سوود لە ژیانی نوێمان وەربگرین.

مورتەزا فینجانی چایەکەی دانایەوە پێش خۆی:

– ئاغای فەرهاد.. بیرەوەرییە گەلەکۆییەکانمان، ئەگەر جاربەجار لەڕێگەی دانیشتن و گفتوگۆکانمانەوە باس نەکرێن و وەبیر نەهێندرێنەوە.. لەناو دەچن.

محەمەدی حاجی زادە، بە ئاوازێک کە دانی بە یەکە یەکەی وشەکاندا دەنا، گوتی:

– هاولاتییە پەناهەندەکان کاتێ لە غەریبیدا لەیەکتر کۆ دەبنەوە و نەریتە پیرۆزەکانی ولاتی خۆیان دەخەنەوە بیری خۆیان، ئەمە وایان لێ دەکا پابەندی ڕەوشت و دینی خۆیان بمێننەوە، ئەو ڕۆحیاتە جوان و نەتەوەییەی خۆیان لەدەست نەدەن!

ئاوازی قسەکانی محەمەدی حاجی زادە یەکسەر ئاوازی قسەکردنی ئەو مەلایانەی بیر خستمەوە کە ئیمامی مزگەوتن. من ویستم وەلامی بدەمەوە، بە هەستێکی زۆر برادەرانە دەستی لەسەر دەستم دانا و نەیهێشت دەست بە قسەکەم بکەم:

– ئێمەی ئێرانی، بەکوردیشەوە، خۆت دەزانی، خاوەن کولتوورێکی ڕەسەن و دێرینین.. چۆن دەبێ ئەم کولتووره دەولەمەندەی خۆمان بسڕینەوە و وابکەین لەبیرمان بچێتەوە؟

من ئەو وەختە هێشتا ئەوەندە دەمم لەگەل محەمەدی حاجی زادە نەکرابووەوە، خەریک بوو پێی بلێم:

– ئەدی مادام وایە بۆ ناگەڕێیتەوە ولاتی خۆت و لێرە بێ ئیش و بێکار ئاوها زەلیل کەوتووی؟

فەرەحناز خانم، خێزانی مورتەزا، بە زەردەخەنەیەکی نەرمەوە دەیویست من بێنێتە بروا:

– ڕاست دەکا.

ئنجا محەمەدی حاجی زادە درێژەی بە ئامۆژگارییەکانی دا:

– چما تۆ کولتووری ئەورووپات پێ ڕەسەنتر و باشترە لەچاو کولتووری ڕەسەنی ئێرانیی خۆمان.. ئاغای فەرهاد؟

بە محەمەدی حاجی زادەم گوت:

– مەسەلەکە ئەوە نیە کام کولتوور ڕەسەنترە، مەسەلەکە ژیان و داهاتووی ئێمەیە. چونکە ئێمە، ئەگەر هەمیشە لە دەوری یەکتر و لەناو یەکتر بمێنینەوە، ئەدی کەواتە بۆ هاتووین بۆ ئەورووپا؟

ئەم قسەیەم وای لە ئەوان کرد چرکەیەک بێدەنگ بن، گوتم:

– ئەگەر ئێوە دەتانەوێ بەردەوام لەناو کولتووری خۆتاندا و بەهەمان نەریتەکانی وڵاتی خۆتانەوە لە ئەورووپا بژین.. بۆچی ئەم هەموو ماندووبوون و ناخۆشییەتان دایە بەر خۆتان تا بگەنە ئێرە؟

تەماشای محەمەدی حاجی زادەم دەکرد:

– ئەگەر دەتانەوێ هەر لەناو نۆستالجیا و بازنەی ژیانی ڕابردووتاندا بسووڕێنەوە؛ کەواتە بۆچی ناگەڕێنەوە؟

هەموویان بێدەنگ، من دیسان گوتم:

– ئێوە.. کەواتە بۆچی هاتوون بۆ ئێرە؟

مورتەزا دڵنیابووم دەیویست بڵێ:

– ئێمە لەدەست بێ دەرامەتی و بێکاری لە ئێرانەوە ڕامانکردووەتە ئێرە.

بەڵام لە شەرمی ئەوەی کە ژنەکەی خۆی لەوێ دانیشتبوو؛ یەکڕاست گوتی:

– هاتووین بۆ ئەورووپا بۆ ئەوەی ئێمەش کەمێک دنیا ببینین.. ئیتر.

فەرەحنازی خێزانیشی، دڵنیابووم دەیویست بڵێ:

– ئێمە لەدەست ئاخوند و عەمامە بەسەرەکانی کۆماری ئیسلامیی ئێران ڕامان کردووەتە ئەورووپا.

بەڵام هەستمکرد ئەویش لە ترسی ئەوەی کە محەمەدی حاجی زادە لەوێ دانیشتبوو؛ گوتی:

– ئێمە لەدەست شەڕ ڕامان کردووە، ئاغای فەرهاد. ئێمە لە تاران تۆپ و هاوەن و ئارپیجی و ناپاڵمەکانی سەدام تا بەر حەوشەی ماڵەکەشمان هاتبوو. ئەی چیمان بکردایە؟

مورتەزا ڕووی کردەوە من:

– چما ئێوەی کوردیش کەم ئەشکەنجەتان بەدەست ڕژێمی سەدامەوە دیوە؟ ئێمە هەموومان قوربانین.. ئاغای فەرهاد!

مورتەزا کە ئەم قسەیەی کرد تەماشایەکی محەمەدی حاجی زادەی کرد. محەمەدی حاجی زادە خۆی کڕ کردبوو، دەیزانی ئەگەر ئەمیش بووایە لە جێگەی مورتەزا هەمان قسەی دەکرد.

لەو ناوە، فەرەحنازی خێزانی مورتەزا گوتی:

– کورد ئەسڵەن لە هەموو میللەتێکی دیکەی عیراق زیاتر چەوسانەوەیان بەدەست سەدامەوە دیوە. قوربانیی هەرە گەورە لە عیراقدا کوردەکانن، ئێوەن.

لەناکاو هەستم کرد ژوورەکە پڕ بووە لە دووکەڵ، جگەرەکەم لەناو تەپڵەکەکەی بەردەممدا کوژاندەوە:

– من تێبینیم کردووە، لەناو ئێمەی ئێرانی و عیراقییەکاندا، تەنانەت لەناو هەموو پەناهەندەکانی لە ڕۆهەڵاتەوە هاتوون، هەمیشە قسەکردن لەسەر ئەوەیە کە لەناووەی وڵاتی خۆماندا کێ زیاترین قوربانیی داوە؟ لە ڕژێمی پێشوودا کام لە ئێمە لە هەموومان زیاتر بووینەتە قوربانی و لە هەموومان زیاتر ئەشکەنجە و ناخۆشیمان دیوە؟

گوتم: ئەمە وەک ئەوە وایە تۆ بێیت خۆت لەبەردەم کەسێکدا ڕووت و قووت بکەیتەوە و برینە ناشیرینەکانی جەستەی خۆتی پێ پیشان بدەیت و پێی بڵێی: «ئەها.. تەماشام کە!». ئاخر.. خەڵکی ئەوروپا لەو کاتەدا بێزت لێ دەکاتەوە نەک بەزەیی پێتدا بێتەوە. فەرەزەن ئەوا بەزەییشی پێتدا هاتەوە! چی؟

ئەوان بێدەنگ بوون، من درێژەم پێ دا:

– بە خەڵکی ئەورووپا چی، کە ئەم برینە ئەحمەق و ئەم زامە ناشیرینانە بە جەستەی تۆوە هەیە؟

تەماشای محەمەدی حاجی زادەم کرد:

– ئەورووپا ئەمڕۆ هیچ ئەوەی بەلاوە گرینگ نییە تۆ ژیانێکی چەندێک سەختت هەبووە و چیت لێ قەوماوە و چیت بەدەست ڕژێمەکەی خۆتەوە دیوە! گرینگ ئەوەیە تۆ ئەمڕۆ چیت؟ دەتەوێ کێ بیت؟ دەتەوێ چی بکەی؟ ئەمە گرینگە لای خەڵکی ئەورووپا.

– زەحمەتە.

محەمەدی حاجی زادە لەبەرخۆیەوە بە ورتە ئەم قسەیەی کرد.

– چی زەحمەتە؟

محەمەدی حاجی زادە گوتی:

– ڕەگوڕیشە چەسپاندن لە جێگەیەکی نوێ، هێزێکی زۆرت لێ دەبا.

– مەبەستت چییە؟

– ئەگەر بتەوێ خۆت لەگەڵ وڵاتێکی تازە ڕابهێنێ، ئەم کارە وزەیەکی یەکجار زۆرت لێ دەستێنێ.

ویستم هانی بدەم:

– بەڵام جەنابت جارێ تازە لە بەهاری تەمەنی خۆتدای.

ئنجا لەناکاو شتێکم بیر هاتەوە:

– من ڕۆژێک لە مەجلیسێکی فەرەنسیدا دانیشتبووم، لەناو ئەوانەدا نەژادپەرستێکی سەر بە حیزبی (ژان ماری لۆ پێن)یش دانیشتبوو، لە وەڵامی نیگارکێشێکی عەرەبی عیراقیدا گوتی:

– ئێوە خۆتان بەرپرسن لەو هەموو ئەو ئەشکەنجەیەی بەدەست سەدامەوە دیوتانە.

هاوڕێ نیگارکێشە عیراقییەکەم بەسەرسوڕمانەوە لێی پرسی: بۆ؟

نەژادپەرستە فەرەنسییەکە گوتی:

– چونکە ئێوە خۆتان دەنگتان داوەتە سەرۆکی وڵاتی خۆتان. نیوەی زیاتری مـــیللـەت بـەردەوام هـەمــــوو ڕۆژێک دەچن چەپڵــــەی بۆ لێ دەدەن و لە سەنگەرەکانی شەڕدا خۆتانی بەقوربان دەکەن.

نەژادپەرستە فەرەنسییەکە بە هاوڕێ نیگارکێشە عیراقییەکەمی گوت:

– بڕۆن هـەمـــووتان پێکەوە تەخت و تاراجی وێران بکەن و ســـەرۆکــێکی دیکەی لەجیاتی دابنێن کە خۆتان بەدڵتانە.

مـحـــەمـــەدی حـاجی زادە و مـورتـەزای گـوڵچین و فـەرەحناز خـانم، هەر سێکیان، دەمیان بووبووە تەڵەی تەقیو، گوتم:

– وابزانم بەنیسـبەت کۆماری ئیسـلامیی ئێرانیشەوە، هەمان شتە، هەمان واقیع و هەقیقـەت. خەڵکی ئێران خۆیان دەنگیان دایە ئاخوندەکان و چوون ئەم عـەمـامـە بەســـەرانەیان هێنایە ســەر حـوکم.. خـۆ ئـەمـڕۆش، ئەمـەتا، ئێرانییەکان خۆیان چەپڵەیان بۆ لێ دەدەن و خۆیانیان بەقوربان دەکەن.

دڵنیا لە قسەکانی خۆم، ڕووم لە مورتەزا کرد:

– وایە؟

فـەرەحناز سەرنجێکی سڵۆکانەی مـحـەمـەدی حـاجی زادەی دا (مـحـەمـەدی حـاجی زادە ئەگەرچی خزمی فـەرەحناز خـانمیش بوو، بەڵام هەستم دەکـرد هەردووکیان نەیاندەوێرا لەبەردەم مـحـەمـەدی حـاجی زادەدا هەموو قسـەیەک بکەن) ئنجا تەماشایەکی مێردەکەی خۆی کرد:

– باشـە. بـا لێرە ڕاوەستین، چونکە باسکردنی سـیاسـەت نـامـانگەیەنێـتە هیچ.

مورتەزا نەیویست وەڵامم بداتەوە. محەمەدی حاجی زادە دیسـان بە هەمان ئاوازی خوتبەدانەکەی، دانی بە یەکە یەکەی وشەکاندا دەنا:

– ئاغـای فـەرهاد.. ئـەمـانـە.. (دەسـتـی بۆ دەرەوە درێژ کـرد؛ مـەبەسـتی ئەوروپاییـیـەکان بوو) هەرچی نەوت و قـازانج و سـامـانە سـروشـتـیـیـەکانی کە ئێمـە هەمـانە دەیاندزن و ڕاپێچی ناو مـەخزەنەکانی خۆیانی دەکەن بۆ کاتی تەنگانەی خـۆیان. لەوسـەریشـەوە هەرچی تانک و تۆپ و ناپاڵم و فـڕۆکـەی شـەڕی و چەکی قورسیان هـەیە پێمـانی دەفرۆشـن بۆ ئەوەی ئێمـە لە ڕۆهەڵات یەکتری پێ بکوژین. شەڕەکانی لای ئێمە هەر خۆیان هەڵی دەگیرسێنن.. بۆ بەرژەوەندیی خـۆیان.. بۆ ئەوەی وڵاتەکـانی ڕۆهەڵات بکەنە بازاڕێک بۆ فرۆشتنەوەی فڕۆکە شەڕی و چەکە قورسەکانیان. فەرەنسا و ئەڵمانیا تاکو ئێسـتاش بەردەوام چەک و تەقـەمـەنی دەفـرۆشنە سـەدام، ئـەمـەریکا ئەمـڕۆ پشـتیـوانی هەرە گەورەی سـەدامـە. هـەمـوو کەسێک ئەمـە دەزانێ. بەرپرسی یەکەم خودی خۆیانن نەک ئێمە!

ئنجا لەناو بێدەنگیی دووای قسەکانی خۆیەوە، دووپاتی کردەوە:

– بەرپرسی یەکەمی برسێتی و بەدبەختیی ئێمە ئەمەریکا و خودی ڕژێمە ئەورووپاییەکانن نەک ئێمە.

من لەو کاتەدا ئەوەم بیر هاتەوە کە محەمەدی حاجی زادە چەند ڕۆژێک پێشتر داوامی لێ کردبوو کارێکی بۆ بدۆزمەوە بۆ ئەوەی بژیوی ژیانی خۆی پێ دابین بکات، بەڵام لەڕووم نەهات ئەم بێکاری و بەدبەختییەی، بە چاوی دابدەمەوە و پێی بڵێم:

– باشە کە تۆ ئێستا لە وڵاتی خۆت دەربەدەر کراویت و هاتوویت لێرە بێ ماڵ و حاڵ بەدووای کاردا دەگەڕێی؛ کێ بەرپرسە لەم بێکارییەی تۆ: کۆماری ئیسلامیی ئێران یان فرانسوا میتران؟

ئاوهام پێ نەگوت، پێم گوت:

– واتە ئێستا، ڕۆئاوا بەرپرسە لە نەهامەتییەکانی ئێمە؟

محەمەدی حاجی زادە گوتی:

– بەڵێ.

پێکەنیم، گوتم:

– لە ساڵی ١٩٨١ کە لە تاران بووم، لەسەر هەموو دیوارەکانی شەقامی (انقلاب) بەگەورەیی نووسرابوو (اروپا بداست، امریکا بدتر است، شوروی از همەشان بدتراست).

محەمەدی حاجی زادە دیسان گوتی:

– بێگومان، بێگومان ئەمە ڕاستە.

ویستم پێی بڵێم: «باشە ئەگەر ڕاستە، کەواتە تۆ بۆچی، بۆ خۆت هەر لە ئێران نەمایتەوە و ڕات کردە ئەم ئەورووپایە؟».

لە ڕووم نەهات تەنانەت پێشی بڵێم «خۆ هیچ نەبێ ئەوروپا ئەمەتا باوەشی بۆت کردووەتەوە و هیچت لێ ناکا، کەچی وڵاتی خۆت، لە وڵاتی خۆت دەری کردیت و ئاوارەی کردووی».

ئاوهام پێ نەگوت، گوتم:

– من باوەڕ ناکەم ئەوروپا ئەو ناڕەواییانە دەرهەق بە هاوڵاتیانی خۆی بکات کە عێراق و کۆماری ئیسلامیی ئێران دەرهەق بە هاوڵاتییانی خۆیانی دەکەن.

محەمەدی حاجی زادە تازە بوو گەیشتبووە پاریس، شانازییەکی یەکجار زۆری بە ئێرانی بوونی خۆی و بە موسڵمانبوونی خۆیەوە دەکرد:

– ئێمەی ئێرانی، هەر هیچ نەبێ، کولتوورێکی ئەسیل و مێژوویەکی دێرین و دینێکی پیرۆزمان هەیە.

محەمەدی حاجی زادە زۆر بەگەرمییەوە لەناو نۆستالجیای ئێرانیبوونی خۆیدا دەکولا، هێشتا جارێ بەتەواوەتی هەستی غەریبیی وڵات لە کانگایدا خامۆش نەبووبووەوە، گوتی:

– من واتێ دەگەم بۆ ئێمەی موسڵمانی ئاوارەی ئەوروپا، پاراستنی ڕەوشت و کولتووری ئیسلام لە نوێژ و ڕۆژوو زۆر گرینگترە.

ئنجا گوتی:

– من ئەمــە چەندین مــانگە لـەناو ئەم چڵکاوەی ئـەوروپا دەخـولێمــەوە.. ئەم فەرەنسییانە کەی بەشـەرن!؟ کەی دەزانن ئەخلاق و عادەت و مرۆڤایەتی چییە! باوەڕم پـێ بکە.. چـەندین مــانگە لەم پاریســە دەســووڕێمــەوە، تـۆ یەکــەمین کەسێکیت لەگەڵی دابنیشم قاوەیەکی لەگەڵ بخۆمەوە.. دەزانـی ئاغای فەرهـاد؟ ئەسـڵەن یەک بەشـەریان، یەک تۆزقاڵ هـەست و مرۆڤـایەتی و میـواندۆسـتییـان نییە. چین ئەمانە؟

ئنجا گوتی:

– من ئـەگـەر لێم نەقـەومــایە چ مــەجـبــوور دەبووم بێم لـێـرە داوای مــافی پەناهەندەیی لەم بێ دین و کافرانە بکەم؟!

من لـەو دەمـــەدا بەدەسـت خــۆم نەبوو پێکەنینـم بە ئـاوازی قــســەکـردنی مـحـەمـەدی حـاجی زادەدا هاتەوە، هـەروەها بە هەندێ لـەو وشـانەی بەکـاری دەهێنان وەکو (کافر) و (بێ دین). دەمێک بوو حەزم دەکرد پێی بڵێم:

– ئاغـای محەمـەد.. ئاوازی قسـەکردنی جـەنابت زۆر لە خوتبەدانی ئیمـامی مزگەوتەکان دەچێ.

لە کۆتاییی جەسارەتم کرد قسەکەی پێ بڵێم.

محەمەدی حاجی زادە لە وەڵامدا یەکسـەر گوتی:

– بەڵێ، وایە. من ئیمامی مزگەوت بووم.

بە سـەرسـوڕماوییەوە لێم پرسـی:

– جەنابت ئیمامی مزگەوت بووی؟

گوتی: بەڵێ، لە مزگەوتی زەینەبە.. لە تاران.

پێم سەیر بوو کە قسەکەم ڕاست دەرچوو:

– بە جیدیتە؟

گوتی: بەڵێ، من ئیمامی مزگەوتی (زەینەبە) بووم لە تاران، لە نزیک پردی (کەریمخان).

لەو دەمەدا مورتەزا دەمی قسەی کردەوە:

– بەڵێ ئیتر.. ئێمە لەگەڵ جەنابی حاجی زادە لە تاران هاوگەڕەک بووین. خزمی فەرەحنازی خێزانەکەمە.

لە دڵی خۆمدا گوتم «لەکۆتاییدا ئەمەتا مەلایەکیشم ناسی کە هاتووە داوای مافی پەناهەندەیی بکا لە پاریس!». ڕووم کردە مورتەزا:

– من بە گاڵتەوە وام گوت.

مورتەزا گوتی:

– نەخێر ئیتر. ئاغای حاجی زادە، نەک هەر لە فیقهی ئیسلامی، بەڵکو لە شەریعەتیشدا شارەزاییەکی باشی هەیە. لە حەوزەی عیلمیی تاران وانەی (ئوسوڵی عەقیدە)ی دەگوتەوە.

– ئەو ڕۆژە لە مۆنتماخت بەهۆی تابلۆی پرۆفیسۆرە سعوودییەکەوە یەکترمان ناسی..

ڕووم لە محەمەدی حاجی زادە کرد: بۆت باس کردن؟

محەمەدی حاجی زادە ڕووی لە مورتەزا:

– بەڵێ...

یەکسەر ڕووی قسەی کردەوە من:

– ئاغای فەرهاد.. من پێم سەیرە ڕەسمکردنی پۆرترێتێک لە پاریس ئەم هەموو پارەیەی پێ دەدرێ!

فەرەحناز خانم ڕووی کردە حاجی زادە:

– ئاغای حاجی زادە، لە ئەورووپا نرخی تابلۆ هەر ئەسڵەن زۆر زۆر گرانە. وەک لای خۆمان نییە.

- دەزانم.

فەرەحناز خانمی خزمی حاجی زادە وەک ئەوەی ڕێنوێنی بکا بۆ باشتر تێگەیاندنی کولتوور و ژیان لە فەرەنسا (چونکە خۆی چەند ساڵێک لەپێشترەوە لە فەرەنسا ژیابوو):

- تابلۆی وا هەیە نرخی دەگاتە پەنجا هەزار دۆلار.

مورتەزاش هەر ڕووی لە حاجی زادە:

- ئنجا سەیر لەمەدایە، تابلۆی وا هەیە لە چەند تۆپەڵە ڕەنگێک و لە چەند خەتێک زیاتر هیچی تری تێدا نابیندرێ.

حاجی زادە وەڵامی هەردووکیانی بە جارێک دایەوە:

- ئەمەش جۆرێکە لە پارە بەهەدەردان و بێ عەقڵییەکانی دیکەیان.

- بەم جۆرە تابلۆیانە دەڵێن (ئەبستراکت).

مورتەزا ڕووی کردە من، دیار بوو حەزی دەکرد بچینە ناو گفتوگۆیەکی هونەری شێوەکارییەوە و لەم بارەوە بۆچوونم بزانێ.

- ئاغای فەرهاد، من هێندە حەز لەو تابلۆیانە ناکەم کە تەنیا چەند تۆپەڵە ڕەنگێک و چەند پانتاییەکی ڕەنگییان تێدایە.

فەرەحناز خانم گوتی: منیش.

- چونکە لەم جۆرە تابلۆیانەدا مەعنا بەهیچ شێوەیەک دیار نامێنێ.

فەرەحناز گوتی:

- ئەسڵەن هیچ فیگەرێکیش نییە ڕێنوێنیت بکا بەرەو واتایەک.

مورتەزا چاوەڕێی دەکرد قسەیەک بکەم:

- تابلۆ دەبێ مانایەکی هەبێ. یان نا؟

من تەماشای نوقتەیەکی سەر دیوارەکەم دەکرد و دەمویست شتێک بڵێم، حاجی زادە لەناکاو گوتی:

– هەموو تابلۆکانیان بەقوربانی یەک تابلۆی (کمال الملک)ی خۆمان بێ!

من لەو دەمەدا خەریک بوو دەست بکەمە پێکەنین.

هێشتا پێ نەکەنیبووم، حاجی زادە گوتی:

– بە چی پێ دەکەنی؟

من پێکەنینەکەی خۆمم شاردبووەوە، گوتم:

– شێوازی تابلۆکانی (کمال الملک) سەد و دە ساڵ زیاترە لە ئەوروپا کۆتاییی پێ هاتووە.

گوتی: ئەدی ئەمڕۆ چ شتێک مۆدێلە؟

گوتم: مۆدێل ڕۆژ بە ڕۆژ خۆی تازە دەکاتەوە.

– چۆن؟

– هەر نیگارکێشێک خۆی بۆ خۆی، خۆی دەکاتە شێوازێک و مۆدێلێک.

مورتەزا بەختەوەرییەکی ئاشکرا لەسەر ڕوخساری، لەناکاو رووی لە فەرەحنازی خێزانەکەی کرد:

– خۆزگە لەم مەجلیسەدا ئێستا (ساقی)ی خوشکم لەگەڵمان بووایە!

–.. خۆزگە!

مورتەزا بەهەمان سۆزی سەر رووی، رووی کردە من:

– ئاغای فەرهاد.. من خوشکێکم هەیە لە ئەمەریکا، لە سان فرانسیسکۆ گەلەریی هەیە.. گەورەترین گەلەرییە لە هەموو سان فرانسیسکۆ. دەڵێم: خۆزگە لەم مەجلیسەدا لەگەڵمان بووایە!

پرسیم: گەلەریی کڕین و فرۆشتنەوەی تابلۆی هەیە؟

– بەڵێ.

ئنجا گوتی:

– بە زێدەڕۆیی وا ناڵێم، لەناو ئەو ژنە ئێرانییانەی گەلەرییان هەیە، ئەمە

ڕای هەمـوو ئێـرانییـەکـانە: تەنیـا دوو ژن هەن لەناو هەمـوو ئێـرانیـیـەکـاندا تابلۆنـاسـی خـاوەن نەزەر بن، یەکـەمیـان (لیلی گوڵسـتـان) دووەمیـان سـاقی گوڵچینی خوشکی من.

فەرەحناز خانم گوتی: ڕاستە.

– گەلەرییـەکانیـان هەمیـشـە جـمـەی دێ،، ئەم لە تاران و ئەویش لـە سـان فرانسیسکۆ، پڕفرۆشترین گەلەریی ئێرانییەکانن لە هەموو دنیا.

من دەبێ دانـی پێدابـنێم، دەمـودەست کـەوتمە سـەر مگێـڕی ئەوەی کـە ئەم سـاقی گـوڵچـینەی خـوشکی مـورتەزای گـوڵچین بنـاسـم بەڵکو هەندێ لە تابلۆکانی خـۆمی پێ پیشـان بدەم بۆ فرۆشـتنەوەیان. بۆ نا؟ دەمـزانی تابلۆ لە ئەمەریکا پارەیەکی باش دەکا ئەگەر گەلەرییەکی باش پەسەندی بکا:

– ئەگـەر حـەز بکەن، هەندێ لە تابلۆکـانی خـۆمی بەدیاری لەشـێـوەی دیاپۆزەتیڤ بۆ دەنێرم. ناونیشانیتان هەیە؟

– بە چاوان.

– حەتمەن خۆشحاڵ دەبێ ئەگەر تابلۆکانی جەنابت ببینێ.

مـورتـەزا، کە دیار بوو شـارەزاییـیـەکی پرۆفیـشنەڵانەی لە نیگارکێشـاندا هەبوو، لێمی پرسی:

– ئاغـای فـەرهاد، ئێوە بە چ شـێـوازێک ڕەسم دەکەن؟ لەسـەر چ ڕێبازێک دەڕۆن؟

گوتم: من لەسـەر هیچ ڕێبازێک ناڕۆم. ڕەسم دەکەم. تەنیا ڕەسم دەکەم.

حـاجی زادە، دیار بوو بەپێـچـەوانەی هـەردووکـیـان، هـیچ چێـژ و پێـوەر و ئاگادارییەکی لە بەستێنی نیگارکێشاندا نەبوو، لێمی پرسی:

– ڕەسمی چی دەکەی؟

موڕتەزا لە گۆشەنیگایەکی دیکەوە دووپاتی کردەوە:

– ڕەسمی چی دەکەی.. ئاغای فەرهاد؟

گوتم: من هەرچی شتێک تێی نەگەم، ڕەسمی دەکەم.

حاجی زادە پرسیی: چی؟

دیسان دووپاتم کردەوە:

– هەرچی شتێک تێی نەگەم، ڕەسمی دەکەم.

حاجی زادە لێمی پرسی:

– هەرچی شتێک (تێی نەگەی).. یان تێی بگەی؟

گوتم: هەرچی شتێک تێی نەگەم.

حاجی زادە تەماشای حونجەکردنی پیتەکانی دەممی دەکرد:

– هەرچی شتێک (تێی نەگەی)؛ ڕەسمی دەکەی؟

گوتم: بەڵێ. هەرچی شتێک تێی نەگەم، ڕەسمی دەکەم.

حاجی زادە دەیویست دڵنیا ببێ.

– هەرچی شتێک (تێی نەگەی)؛ ئنجا ڕەسمی دەکەی؟

پێ نەکەنیم، گوتم:

– بەڵێ، هەرچی شتێک تێی نەگەم ئنجا ڕەسمی دەکەم.

حاجی زادە گوتی: بۆ؟ بۆ ئەو شتانە ڕەسم دەکەی کە تێیان ناگەی؟

گوتم: نەک تەنیا ئەو شتانەی تێیان ناگەم، بەڵکو هەموو ئەو کەسانەش کە تێیان ناگەم.. ڕەسمیان دەکەم.

حاجی زادە پرسی:

– باشە، بۆ؟ بۆچی تەنیا ئەو شتانە و ئەو کەسانە ڕەسم دەکەی کە تێیان ناگەی؟

گوتم: چونکە دەمەوێ تێیان بگەم.

دڵنیا بووم حاجی زادە یەکەم جاری بوو گوێی لەم قسانە بێت لەبارەی ڕەسمکردنەوە. گوتم:

– هەر وەختێک کە دەکەومە سەر ڕەسمکردنی ئەو شتەی یان ئەو کەسەی کە تێی ناگەم، ئیتر وردە وردە لەگەڵ تەواوکردنی ڕەسمەکە تێی دەگەم.

وا دیار بوو لای حاجی زادە ئەم بۆچوونەی من، وەک گەمەیەکی لێ هاتبوو، لێمی پرسی:

– ئەدی بۆچی ئەو شتانە و ئەو کەسانە ڕەسم ناکەی کە تێیان دەگەی؟

گوتم: زۆر پێویست نییە ئەو شتانە و ئەو کەسانە ڕەسم بکەم کە خۆم پێشتر تێیان گەیشتووم.

ئنجا گوتم:

– ئینسان چ پێویست دەکا خۆی بە شتێکی ئەوتۆوە سەرقاڵ بکا کە پێشتر تێی دەگا؟

من دەمزانی گفتوگۆکەمان حاڵەتێکی هەندێک کۆمێدیی وەرگرتبوو، بەڵام سەبارەت بەوەی کە یەکەم جارم بوو لەگەڵ هەر سێکیان دانیشتبووم و تازە بووبووینە ئاشنای یەکتر، نەمدەتوانی پێ لەوە زیاتر هەڵببڕم.

مورتەزا لەولاوە، وابزانم بۆ حەنەک، یانیش بۆ ئەوەی کە حاجی زادەم لەکۆڵ بکاتەوە، هەڵی دایە:

– ئاغای فەرهاد.. ئێستا حەزدەکەی ڕەسمی من و فەرەحناز بکەی، ڕۆژێک؟

دەمودەست گوتم: «ئومێدەوارم».

حاجی زادە وەک لە زۆرانبازییەک هاتبێتە سەر پشوودان، پشتی بە بالیفە ئێرانییەکەی پاڵ دیوارەکەوە دابوو، دیار بوو دەیویست لە گفتوگۆکە بکشێتەوە، ڕووی کردە فەرەحنازی خزمی.. بە حەنەکەوە گوتی:

– من سەرم لە فەلسەفەی ئەم نیگارکێشە کوردە دەرناچێ.

مورتەزا گوتی:

– ئاغای فەرهاد، تۆ دیاپۆزەتیڤی تابلۆکانی خۆتم بدێ.. بۆ ساقیی

خوشکم دەیانێرم.

پێم خۆش بوو مورتەزا خۆی ئەم داوایەی لێ کردم.

– دڵنیام پەسەندیان دەکا.

– سوپاست دەکەم.

لەو ڕۆژەوە بوو... بەهۆی مـحـەمـەدی حـاجی زادەوە، خـاوەنی نـاودارترین گەلەرییەکانی سان فرانسیسکۆ بووە هاوکارم.

- ئەو پیاوە ئێرانییە کێیە کە دەقاودەق بە لووسیانا دەچێ؟

مەدام (گالاتتی)، دایکی مسیۆ لووسیانا، تەمەن دەوروبەری حەفتا ساڵ، لە رۆژێکدا دوو جار دەهات بۆ هوتێلەکە. هەموو بەیانییەک، سەعات دەوروبەری حەوت (پێش ئەوەی هوتێلەکە جێ بهێڵم) بۆئەوەی پسووله و حیساباتی هوتێلەکەی رادەست بکەم. جاری دووەمیش شەوان دەوروبەری سەعات نۆ و نیو، بۆ ئەوەی چاوێک بە هوتێلەکەدا بخشێنێت و سۆراغی پێداویستییەکانی هوتێلم لێ بکات (بۆ نموونە ئەگەر بۆ کافتریای هوتێلەکە شەکر یان قاوەمان پێویست بووایە).

دەچوو سەرێکی لە کافتیریاکە دەدا و بەدەم خواردنەوەی قاوەیەکەوە بۆ ماوەی چارەگە سەعاتێک، هەندێ حیسابات و نووسینی لەوێ دەکرد. ئنجا لەکۆتاییدا - گوێم لە ئاوازی پیری هەنگاوەکانی و تەقەتەقی لەسەرخۆی بابووجەکەی بوو؛ هێور هێور، سەرێکی لە کۆگا پانوپۆڕەکەی هوتێلەکەش دەدا (کۆگایەکی درێژکۆڵەی، کەمێک تاریک و شێدار) بەرامبەر ئەو پێشوازییەی لێی دادەنیشتم.. ئنجا دەڕۆیشت:

- ئۆغقواغ..

لەم وشەیە زیاتر، هەرگیز هیچ قسەیەکی دیکەی لەگەڵم نەدەکرد.

منیش بە هەمان شێوە:

- ئۆغقواغ.

دەمزانی کە من لەو هوتێلەی ئەواندا لە فەرمانبەرێک زیاتر هیچی تر نیم. دەبووایە سنووری کار و قسەی خۆم باش لەبەرچاو بگرم.

چەندین ساڵ لەو هوتێلە کارم دەکرد؛ یەکەم جار بوو مەدام گالاتتی پرسیارێکم لێ بکات کە پێوەندیی بە هوتێل و کارەکەمەوە نەبێ.. درێژەی بە پرسیارەکەی خۆی دا:

– لووسیانای کوڕم بۆی گێڕامەوە.

مەدام گالاتتی پرسیارەکەی لە کات و شوێنێکی وادا نەکرد کە نیشان بدا مەسەلەی لێکچوونی مسیۆ لووسیانای کوڕی و محەمەدی حاجی زادە لای ئەو هێندە گرینگ بێ (خەریک بوو هەندێک کاغەز و پسوولەی، کە لە کافتیریاکەوە لەگەڵ خۆی هێنابوونی، دەخستە ناو جەنتا دەستییەکەیەوە و دەڕۆیشت)، بۆیە منیش، بە زەردەخەنەیەکی پڕ لە حورمەتەوە کە هەمیشە لەگەڵی پێی ڕاهاتبووم؛ سەرپێییانە وەڵامیم دایەوە:

– ئەگەر چاوت بەم محەمەدی حاجی زادەیە بکەوێ، مەدام.. باوەڕ بکە، واقت وڕ دەمێنێ؛ وادەزانی لووسیانای کوڕەکەی خۆت دەبینی.

– بەڕاست؟

– هەمان سەر و سیما و ئادگار.. تەنانەت قەد و باڵاشیان هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ یەکتر نییە. ئێمەی کورد دەڵێی «سێوێکن و کراون بە دوو لەتەوە».

مەدام گالاتتی، دەمزانی چەنێک لووسیانای کوڕە تاقانەکەی خۆی خۆش دەویست، کە تاقە یادگارێک بوو لە بنەماڵە جوولەکە پورتوگاڵییەکەیانەوە مابووەوە؛ پرسیی:

– ئێرانییە؟

گوتم: بەڵێ.

– برادەرتە؟

– بەڵێ.

مادام گالاتتی نەیگوت: «بانگی بکە ئێرە با ڕۆژێک بیبینم»، گوتی:

– سەیرە!

جەنتاکەی کردە شانی و.. وێنەی زەردەخەنەیەکی سەرسوڕماو، زەردەخەنەیەکی زۆر لەدڵەوەی خۆی، لەناو چاوانی مندا بەجێ هێشت و ڕۆیشت:

– ئۆغڤواغ.

## کاریگەریی شیعری فەرەنسی

## بەسەر نیمایۆشیجی شاعیری گەورەی ئێرانەوە

مسیۆ لووسیانا، بەپێچەوانەی دایکی، زوو زوو دەهات بۆ هوتێلەکە. هیچ ساتێکی دەستنیشانکراوی نەبوو، لەناکاو لە زەنگی دەرگای هوتێلەکەی دەدا و (لە ئاوێنەکەی بەرامبەرمەوە دەمدیت) پەنجەم دەنا بە دوگمەیەکی دەستەچەپمەوە و دەهاتە ژوورەوە.

پێش هەموو شتێک سڵاوێکی دۆستانەی لێم دەکرد، (هەرگیز داوای لێم نەدەکرد بچم قاوەیەکی بۆ بێنم بەڵکو خۆی) دەچووە مەتبەخ قاوەیەکی بۆ خۆی تێ دەکرد و دەهات لە تەنیشتمەوە دادەنیشت.. بە زەردەخەنەوە:

– سا ڤا..؟

– Ca va.

مسیۆ لووسیانا، ئەگەرچی بۆ چاودێریکردنی (فەرمانبەرێک) دەهاتە هوتێلەکەی خۆیان (هیچ نەبێ لە دیدی دایکییەوە) بەڵام ڕاستییەکەی، هیچ ڕۆژێک نەمبینی مسیۆ لووسیانا هیچ کیتاب و حیسابێکی هوتێلەکەم لەگەڵ بکا. زۆربەی جار وەک دوو هاوڕێ دەکەوتینە گفتوگۆ لەبارەی فەلسەفە و هونەر، بەتایبەتیش لەبارەی سیاسەتی کۆماری ئیسلامیی ئێران و ئەدەبیات و ژیانی ڕۆژهەڵاتەوە.

مسیۆ لووسیانا، پیاوێکی باڵابەرزی تەمەن دەوروبەری چل و پێنج ساڵ (چەند ساڵێک لە من بەتەمەنتر)، موو قاوەیی، چاو هەنگوینی، قۆز، هەمیشە چوست و چالاک، خاوەنی بڕوانامەی ماجستێر لەبارەی زمان و ئەدەبیاتی ئێران؛ لە هەمان کاتدا قوتابیی دوکتۆرا بوو لە بەشی ئێرانناسیی زانکۆی

سـۆربـۆن لە Censier . دەیگوت: «جـار بـە جـار دەچمـە بەرلین و مـۆسکۆ بۆ پێشکەشکردنی سیـمیـنارەکـانم لەبارەی ڕۆژهەڵاتناسی». من هەرگیـز هیچ تۆژینەوەیەکی ئەوم نەخـوێندبووەوە بەڵام دەمـزانـی جگە لە وانەگـوتنەوەی (ڕۆژهەڵاتناسی) لە زانکۆی نانتێغ Nanterre، دەیگوت: «جار بە جار وتاریش لە کۆوارە ئەکادیمییەکاندا بڵاودەکەمەوە».

کاتێ سـەرنجی سـەر و سیمـای مسیۆ لووسیانام دەدا و لە ڕۆحیاتی ورد دەبوومـەوە و لە زەینی خۆمدا بەراوردیم لەگەڵ محەمـەدی حاجی زادە دەکرد، یەک لە جیاوازییـەکانی نێوان ئەم و محـەمەدی حاجی زادە ئەوە بوو کە مسیۆ لووسـیـانا – دیار بـوو – لە منداڵـیـیـەوە بە نـاز و گـۆزی دایکێکی چاودێر و مـیـهـرەبان پـەروەردەکـرابوو (لەم ڕووەوە باندەسـتی ئەم بایەخـدانە ئەرسـتۆکراتییـە بەسـەر هەمـوو ڕەفتـار و شێوازێکی ژیانیـەوە ئاشکرا بوو). ئەمە لەکاتێکدا لەسـەر ڕوخسـاری محەمـەدی حاجی زادە، زیاتر نیشانەگەلی منداڵییەکی بەدبەخت و هەژار دیار بوو. ئەمە یەکێک بوو لەو جیاوازییانەی کە من دەمتوانی لەیەکتریان جیا بکەمەوە.

بە بیـرمـە، لە هەفـتـەی یەکـەمی دەوامکردنم لـە هوتێلەکـە (پێم وابێ مـەدام گالانتیی دایکی پێی گوتبوو کەوا من کوردی عیـراقم) کاتێ هـات سـەری لێ دام و یەکترمان ناسی، لووسیانا بەفەرەنسی لێمی پرسی:

– کەواتە.. تۆ.. فارسیش قسە دەکەی!

من زۆر کـەیفم بـەخـۆم هـات ئەگـەر گوتم «بـەڵێ.. فـارسـیـش قسـەدەکـەم»، کـەچی کاتێ مـسیـۆ لووسـیـانا دەسـتی کردە قسـەکردن بە فـارسـیـیـەکی هێندە تۆکمـە، تەریق بوومەوە و پێ کەنیم.. بەڵام هەر بە فارسی درێژەم پێ دا، گوتم:

– ئەللا لا.. بەڵام نەک وەکو جەنابت، هێندە ڕەوان!

مسیۆ لووسیانا بە فارسییەکی زۆر ڕەوان قسـەی دەکرد.

دەیگوت کـە هـەر لـە تەمـەنی بیـست و یەک سـاڵـیـیـەوە خـۆی سـەرقـاڵی

فێربوونی فارسی کردووە. ئنجا هەر هەمان شەو، باسی ئەوەی بۆ کردم کە ئێستا خەریکی نووسینی تێزی دوکتۆراکەیەتی لەبارەی (کاریگەریی شیعری فەرەنسی بەسەر نیمایۆشیجی شاعیری گەورەی ئێرانەوە).

من زۆرم پێ خۆش بوو کە خاوەن هوتێلەکەم هێند نزیکە لە ڕۆحیاتی من و هێندەش متووی بوارگەلێکە کە منیش لەناویاندا هەناسە دەدەم. لە توێی قسەکانییەوە، وەک ئەوەی بیەوێ تاقیم بکاتەوە، لێمی پرسی: «دەیناسی..؟».

من لە کەرەج، ئەو وەختەی پەناهەندە بووم لە ئێران، شیعرەکانی نیمایۆشیجم هەمووی خوێندبووەوە، گوتم:

– (ای ادمهای..)ی ئەوم لە هەموو شیعرەکانی پێ جوانترە.

لەدووای ئەم قسەیەمەوە، کە یەکەمین پێنج دەقیقەی یەکترناسینمان بوو، داوای لێ کردم چیتر لەکاتی ناوهێنانیدا وشەی (جەناب Vous) بەکارنەهێنم بەڵکو وەک هاوڕێیەک بە (لووسیانا) ناوی ببەم. لە پزیسکی چاوەکانیشیەوە هەستم پێ کرد کە زۆر دڵخۆشە بەوەی هاوەڵێکی دیکەی پەیداکردووە تا لەگەڵی بتوانێ باسی کولتووری ئێرانی بکا.

– خۆشحاڵم بە ناسینت.

پێنج ساڵ زیاتر بوو لە پاریس دەژیام، هیچ کەسێکم نەناسیبوو هێندە بەگەرمی و هێند لە ناخی دڵەوە وەک مسیۆ لووسیانا پێم بڵێت: «خۆشحاڵم بە ناسینت».

## بۆچی لە هیچ وڵاتێکی موسڵماندا

## دوو پەناهەندەی ڕۆژئاوایی نابینین؟

مسیۆ لووسیانا دەیگوت کە بەدرێژاییی هەموو ژیانی، هەرگیز «تەنانەت یەک جاریش» نەچووە بۆ ئێران. سەیرم پێ دەهات!

ئەو فارسییە باشەی قسەی پێ دەکرد، بۆ ماوەی چوار ساڵ لە ئەنستیتووی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکانی پاریس Inalco فێری بووبوو. بەو تەمەنەیەوە دەیگوت کە بە زمانی ئینگلیزی و پورتوگاڵیش زۆر بەباشی قسە دەکا و دەخوێنێتەوە.

– مرۆڤی ئەوروپایی لەچاو مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی، زۆر بەهرەمەندترن بۆ فێربوونی زمان.

لە وەڵامدا پێی گوتم:

– بۆ وا دەڵێی؟ ئەمەتا تۆش، جگە لە زمانەکەی خۆت، زمانی فەرەنسی و فارسی و عەرەبیش دەزانیت.

تێبینیم کردبوو، ئەو قسانەی لەبارەی خۆمەوە دەمکردن هەمیشە لە یادەوەریی مسیۆ لووسیانادا دەمانەوە. چونکە پێشتر بەفراوانی بۆم گێڕابووەوە کە من چۆن لە ساڵی (١٩٨١)دا، واتە لە دەسپێکی شەڕی عێراق و ئێراندا، لەدەست سەربازی ڕام کردبووە ئێران و بۆ ماوەی هەشت مانگ لە ئۆردووگای پەناهەندانی کوردی عیراق لە (مەیدانی ذوب اهن) لە شاری (کەرەج) مابوومەوە؛ چۆنیش پاشان لەوێوە بەڕێگای سووریاوە چووبوومە پۆڵۆنیا و ئنجا ئەڵمانیا؛ چۆنیش لەوێوە – دووای ساڵێکی ڕەبەق چاوەڕوانی بۆ وەرگرتنی مافی پەناهەندەیی – بەقاچاغ سنووری ئەڵمانیام بڕیبوو و خۆم

گەیاندبووە فەرەنسا. بۆ مسیۆ لووسیانام باس کردبوو کە من ئەو فارسییەی دەیزانم لەکاتی پەناهەندەییمدا لە کەرەج فێری بووبووم. گوتم:

– بەڵام من فارسییەکەم هێندە باش نییە.. ناتوانم پێی بنووسم.

گوتی: منیش عیبری نازانم و پورتوگاڵییەکەم هێندە باش نییە، ئەگەرچی بەئەسڵ جوولەکەی پورتوگاڵیشم.

مسیۆ لووسیانا ڕەگەزنامەی فەرەنسایی هەبوو و خۆیشی بە فەرەنسیی دەزانی بەڵام بەئەسڵ جوولەکەی شاری (بێلمۆنت)ی پورتوگاڵ بوو. هەمیشە بە ئاوازێکی ئەوتۆ لەگەڵم دەئاخاوت کە من هەست نەکەم ئەو لە خۆم باڵاتر ببینم.

وابزانم بەم ڕەفتارە خاکەڕایەی، دەیویست دڵنیام بکات لەوەی کە ئەو (سەبارەت بەوەی لەلایەکەوە دوکتۆرا دەخوێنێت و لەلایەکی دیکەشەوە خاوەنکاری منە) خۆی لە من بڵندتر نابینێت. ئنجا ڕاستییەکەیشی، بەدرێژایی هەموو ئەو چەند ساڵەی کە من لە هوتێلەکەیان کارم دەکرد هەرگیز فیزێکی وای دەرنەدەخست ئەو (ساخبێر)ی من بێ.

جلوبەرگیشی، بەپێچەوانەی ئەو جوولەکانەوە بوو کە لە شەقامەکانی پاریسدا دەمبینین. شەپقەیەکی ڕەش لەسەر، ڕیشیان بەردابووەوە، یانیش کڵاوێکی ڕەشی بچکۆڵەیان بە دەمبوورێک لە تەوقی سەری خۆیان دەدا بۆ ئەوەی بناسرێنەوە جوولەکەن. هەمیشە جلوبەرگێکی ئاسایی، بەڵام گەنجانە و ڕێکپۆشی لەبەردەکرد. جارجاریش تێبینیم دەکرد، ئەو کراسە کشمیری و ئێرانییانەی لەبەردەکرد کە بازرگانە ئێرانی و چینییەکان بەتایبەتیش بازرگانە هیندییەکانی لە هیندستانەوە دەهاتن و (لە هوتێلەکەی خۆمان) دادەبەزین لەگەڵ خۆیان دەیانهێنا.. دەمدیت ئەو کراسە جوانانەیان بەدیاری پێشکەشی مسیۆ لووسیانا دەکرد کە من هەندێ جار هەر بە بۆنەکەیان لە دوورەوە دڵم پێیان دەگەشایەوە. مسیۆ لووسیانا دەیگوت:

– کراسی یەخە داخراوی ئێرانیم زۆر پێ جوانە.. دەڵێن خەڵک لە

ئەسفەهان زۆرتر لەم جۆرە کراسانە لەبەردەکەن.

من هەر لە سەرەتاوە لێم بووبووە مەرەق: پیاوێکی گەنجی پاریسی، بەئەسڵ جوولەکەی پورتوگاڵ، قوتابیی دوکتۆرا لە زانکۆی سۆربۆن، خۆی و دایکی خاوەن هوتێلێکی سێ ئەستێرەی لووکس لە پاریس (کە درەنگتر زانیم خاوەن دوو هوتێلی دیکەشن؛ یەکەمیان لە ئۆکسفۆرد، دووەمیشیان لە تەل ئەبیب) .. بە چ ئامانجێک خۆی فێری زمانی فارسی کردووە؟ لەپێناو چی لە ئەدەبیاتی ئێرانی دەکۆڵێتەوە؟ بۆ؟

مسیۆ لووسیانا کەمێک داما، وای پیشان دا ئەمە یەکەم جار بێ لە ژیانیدا ئەم پرسیارەی ڕووبەڕوو کرابێتەوە؛ بەڵام من وام هەست کرد بیەوێ لەکاتی قسەکردندا شتێکم لێ بشارێتەوە. لە کۆتاییدا تەماشایەکی کردم.. (هەندێ جار لە نیگای مسیۆ لووسیانا دەسڵەمیمەوە)، گوتی:

– تۆ حەزت لە نیگارکێشانە.. وایە؟

– بەڵێ.

دووای قەیرێک بێدەنگی، کە باش دیار بوو دەیویست لەناو ئەو بێدەنگییە درێژەدا شتێکی نهێنی یان گرینگ بشارێتەوە، هەناسەیەکی حەسرەتی هەڵکێشا و گوتی:

– منیش.. حەزم لە ئەدەبیاتە.

هەناسە حەسرەتاوییەکەی، هێندە پڕ سوێ و قووڵ، ڕێگەی لەوە دەگرت کە من بڕوا بهێنم کە هۆی ئەم بایەخدانەی وی بە ئێران و زمانی فارسی تەنیا حەزێکی ئاسایی بێت بۆ ئەدەبیات. باوەڕم نەدەکرد. بە تێگەیشتنی من، هۆ و ئامانجی دیکە لە ئارادا هەبوو.

ڕاستییەکەیشی، مسیۆ لووسیانا، جگە لە ئەدەبیات، خولیا و شارەزاییەکی زۆری لە بەستێنی سیاسەتی نێودەوڵەتیشدا هەبوو، بەتایبەتیش لەبارەی سیاسەت و مێژووی ئیسلام، نەمازە مێژووی ئێران و تورکیا. هەر لە زەمانی سەرهەڵدانی ئیسلامەوە تا دەگاتە کولتووری ئەمڕۆی

کۆماری ئیسلامیی ئێران.

مسیۆ لووسیانا هەر لە یەکەم ساتەکانی یەکترناسینمان لێمی پرسی:

– ڕات بەرامبەر ئەو سیستەمەی کۆماری ئیسلامیی ئێران چییە؟

من باش لە پرسیارەکەی نەگەیشتم، گوتم: سیستەم؟

وابزانم دەیویست باشتر بمناسێ، گوتی:

– تۆ هەشت مانگان لە ئێران ژیاوی.. لەوێ چیت بینی؟ هەستت بە چی کرد؟ ئاخۆ مرۆڤ.. لەوێ باشتر دەژین یان لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا؟

لەناو هۆڵی پێشوازیی هوتێلەکە دانیشتبووین. دوو قاوە لەنێوان هەردووکماندا هەبوو. ئەوەی من، دەمێک بوو تەواو بووبوو بەڵام قاوەکەی ئەو هێشتا تێیدا مابوو. جگە لەمەش مسیۆ لووسیانا ساخبێرم بوو؛ بیرێکم لە پرسیارەکەی کردەوە و لێم پرسی:

– بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەکرێ پرسیارێک لە جەنابت بکەم؟

– بێگومان.

گوتم: ژمارەی ئەو مرۆڤە ڕۆژهەڵاتییانەی لە وڵاتانی ئەورووپا دەژین لەچاو بەو مرۆڤە ئەورووپاییانەی لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا دەژین، چەندە؟

وەک شتێک بەر سەری کەوتبێ، گوتی: چی؟

گوتم: بۆچی لە هیچ وڵاتێکی موسڵماندا دوو پەناهەندەی ڕۆژئاوایی نابینین؟

زیرەکانە تەماشای ناو چاومی کرد، دەمزانی پرسیارەکەم کونجکۆڵیی ئەوی ورووژاندووە.

مسیۆ لووسیانا جێگەی کورسییەکەی ژێر خۆی خۆشتر دەکرد، دەیویست لەسەر کورسییەکەیەوە باشتر گوێ بۆ قسەکانم ڕابدێرێ. گوتم:

– ئەمە لەکاتێکدا تەنیا لە وڵاتێکی وەکو دانیمارک، کە ژمارەی

دانیشتوانەکەی پێنج ملیۆن کەسە، یەک ملیۆن تەواوی خەڵکی دانمارک بەئەسڵ پەناهەندەن!

وەک قوتابییەک گوێ بۆ مامۆستایەکی خۆی شل بکا، ملی لار کردبووەوە و گوێی ڕاگرتبوو. گوتم:

– ئەمە مانای چییە؟

نازانم بۆچی، پێ کەنی و گوتی:

– ئەمە مانای وایە کە ئەوروپاییەکان خۆیان ئەوروپای خۆیان دروست کردووە، ئێوەش دەبێ خۆتان ئەوروپایەک بۆ خۆتان لەسەر خاکی خۆتان دروست بکەن! ناسنامە! ناسنامەی خۆتان!

پێی لەسەر وشەی «ناسنامە» داگرت.

– مەبەستتان چییە کە دەڵێن «ناسنامە»؟

گوتی: پێویستە ناسنامەیەکی خۆتان هەبێ.

ئنجا گوتی:

– پێویستە ناسنامەیەکی خۆتان هەبێ، نەک ئەوروپا وەک ماسک و دەمامکێکی خوازراو بنێن بە ڕوخساری خۆتانەوە.

پاشان گوتی:

– بۆ ئەوەی لە قسەکەشم بەهەڵە تێ نەگەی، دەمەوێ پێت بڵێم کە پرسیارەکەت مانایەکی دیکەشی هەیە؛ وڵاتەکانی ڕۆهەڵات بەوانەی ئێوەشەوە، سیستەمێکی تۆتالیتار و دکتاتۆر بەڕێوەیان دەبەن. وایە؟

تەماشای ناو چاومی دەکرد و چاوەڕێی وەڵامدانەوەی منی دەکرد. گوتم:

– وایە.

گوتی: کەواتە، دەبێ ئێوە ڕۆڵی خۆتان هەبێ لە سەرنگوونکردنەوەی ئەم ڕژێمانەی خۆتان.

ئنجا گوتی:

– من مارکسی و کۆمۆنیست نیم، بەهەڵە تێم نەگەی!

پاشان لەژێر برۆکانییەوە پێ کەنی، گوتی:

– نەژادپەرستیش نیم.

مسیۆ لووسیانا کاتێ وتی (ئێوە دەبێ رۆڵی خۆتان هەبێ لە سەرنگوونکردنەوەی ئەم رژێمانەدا) من کەمێک تەریق بوومەوە؛ بەڵام نەیهێشت ئەم تەریقبوونەوەیەم دۆخێکی نێگەتیڤ لەناو گفتوگۆکەماندا دروست بکات؛ یەکسەر پێی گوتم:

– خۆ منیش دەزانم، هەڵبەتا. مرۆڤ لای ئێوە ئەگەر باشتر بژیایە، تۆ بۆچی پەنات دەبردە بەر ئەوروپا؟!

ئنجا بە هەمان مەبەستی دڵدانەوەی من:

– شتێکی دیکەشت پێ بڵێم: بەشێکی زۆر لە جوولەکەکانی پورتوگاڵیش (ئەو وڵاتەی کە من تێیدا لەدایک بووم) بەئەسڵ مەغریبین، بریتین لەو جوولەکانەی کە لەدەست زوڵمی رژێمی ئیسلامیی مەغریب وەختی خۆی پەنایان بردووەتە بەر پورتوگاڵ، هەندێکی دیکەش ئەو جوولەکانەن کە لەدەست نازییەکانی ئەڵمانیا رایان کردووەتە پورتوگاڵ.

ئەم قسانەی مسیۆ لووسیانا کلیلێک بوون بۆ کردنەوەی دەرگای گفتوگۆیەکی درێژ، کە لە یەکەم شەوی یەکترناسینماندا لەناو هۆڵی پێشوازیی هوتێلەکەدا، زیاتر لە سەعاتێک و نیوی خایاند.

مسیۆ لووسیانا دەیگوت کە جوولەکەکانی پورتوگاڵ، بەدرێژایی سەدەکانی رابردوو، وەک میللەتی کورد ئەمڕۆ لە تورکیا و ئێران و سووریا.. مافی هاوڵاتیبوون و رەگەزنامەیان هەرگیز پێ نەدراوە و نەیانتوانیوە مومارەسەی دین و کولتووری نەتەوەییی خۆیان بکەن؛ بۆیە بەدرێژاییی سەدەکانی رابردوو جوولەکەکانی پورتوگاڵ لەدەست زوڵمی پاشا یەک بەدووای یەکەکانی

پورتوگاڵ هەمیشە ڕایان کردووەتە وڵاتەکانی دەوروبەر.

– ئەمەتا تەماشاکە، تاکو ئەمڕۆش لە سەدا چواردەی دانیشتووانی بەلجیکای ئەمڕۆ بەئەسڵ جوولەکەی پورتوگاڵین. ئەمە جگە لەوەی کە چەندین پاشای پورتوگاڵی، بۆ نموونە پاشایەکی وەک (مانوێلی یەکەم) لە دیسەمبەری ساڵی (١٤٩٦)، واتە پێنج سەد ساڵ بەر لە ئەمڕۆ، هەر بە بڕیارێکی فەرمی، فەرمانی دەرکردنی سەرتاسەری جوولەکەکانی پورتوگاڵی ڕاگەیاند.

لووسیانا دڵی منی دەدایەوە:

– ئێوەی کورد لەچاو جوولەکە هەر هیچتان نەدیوە!

دەیگوت ئێمەی جوولەکەی پورتوگاڵی لە سەدەی بیستەمیشدا، تەنانەت تا ساڵی (١٩٧٤)یش، کە ساڵی هاتنە سەر حوکمی دیموکراسییە لە پورتوگاڵ، هەندێکمان لە ترسان، زۆربەشمان لە برسان.. بەردەوام ڕامان کردووەتە وڵاتانی تری ئەوروپا.

مسیۆ لووسیانا دەیگوت:

– بنەماڵەی ئێمە، واتە باوکم و دایکم، لەگەڵ من (کە ئەوکاتە منداڵ بوومە) لە ساڵی ١٩٥٣ ڕامان کردووەتە پاریس و.. لێرە.. ئەم هوتێلەمان کڕیوە.

ئنجا لە کۆتاییی قسەکانیدا، بەبیرمە، خاکەڕایانە، گوتی:

– وایشی مەبینە کە هەر هەموو جوولەکەکانی پورتوگاڵ خواپێداو بین.. نا.. ئێمەش.. ئەو پورتوگاڵییانەی لە پورتوگاڵەوە ڕامان کردووەتە فەرەنسا، تاکو ئەمڕۆش، زۆربەی هەرە زۆرمان لە فەرەنسا دەرگەوانین، یانیش پاسەوان و خزمەتکاری ماڵە دەوڵەمەندەکان.

ئنجا گوتی:

– بەڵام ماڵباتی ئێمە، بەختی ئەوەمان هەبوو کە سەروەت و سامانمان لە دەرەوەی پورتوگاڵدا وەگەڕخستبوو.

لووسیانا باسی ئەوەی نەکرد ئاخۆ ئەو سەروەت و سامانەی خۆیان لە کام

ولآت بەگەڕخستبوو؛ منیش بە جوانم نەزانی لێی بپرسم. هەرچەند من بیرم بۆ ئیسرائیل دەچوو و دەمگوت هەبێ و نەبێ باوکی مسیۆ لووسیانا لەبەرئەوەی جوولەکە بووە، لەوانەیە ئەو سەروەت و سامانەی خۆی لە ئیسرائیل وەبەرهێنابێ. ئنجا شێلگیرانە.. بیری کردەوە، گوتی:

– ڕاستییەکەیشی، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ زیرەکیی باوکم. ئەگەر ئەم دووربینی و زیرەکییەی باوکم نەبووایە، ئێمەش ئێستا وەک زۆربەی پورتوگاڵییە پەناهەندەکانی پاریس، یان دەرگەوان بووین یانیش خزمەتکاری ماڵەگەورەکان.

من لەو دەمەدا جوولەکەکانی جارانی گەڕەکی منداڵیی خۆمم بیر کەوتەوە لە هەولێر؛ دایکم بۆمی دەگێڕایەوە کە چۆن لە ساڵی (١٩٥١) بە بڕیاری فەرمیی نووری سەعیدی مەلیکی عیراق هەر هەموو جوولەکەکانی کوردستان بنەوبارگەیان پێچاوەتەوە و بەزۆرەملێ ڕەوانەی ئیسرائیل کراون! دایکم دەیگوت: «ئێمەی کوردی موسڵمان لەو کاتەدا چووین هەر هەموو کورسی و مێز و ئاوێنە و سندووق و کەنتۆر و نوێن و کەوگیر و قاپوقاچەغە فرێدراوەکانی ئەو جوولەکانەمان، کە لەبەردەم ماڵی خۆیاندا کەڵەکەیان کردبوون، بە نرخێکی زۆر هەرزان کڕییەوە تەنیا بۆ ئەوەی لەڕێگەی ئاوارەبوونی خۆیاندا ئەو جوولەکە بەستەزمانانە هیچ نەبێ هەندێک پارەی کەمیان پێ بێت بۆ ئەوەی لەڕێگە باروبوویان بکات». دایکم دەیگوت:

– جوولەکە دەڵێن «چێڵ لە هەر کوێیەک بزێت گرینگ نییە، بەڵام ئەوەی گرینگە ئەمەیە کە بێچووی چێڵەکە هی خۆمان بێت».

مسیۆ لووسیانا، لەناکاو، بەنائومێدییەوە تەماشایەکی سەر زەوییەکەی کرد، وەک برینێکی کۆنی کولابێتەوە:

– بەڵام.. سەروەت و سامان بە چی دەچێ!

ئەم قسەیەی کرد و یەکسەر تەمی هەستێکی فیگاریی قووڵ، کە لە نائومێدییەک دەچوو، کەوتە سەر ڕووی؛ ڕۆحی کوژاندەوە. دووای ئەوە ئیتر..

هیچی دیکەی نەگوت.

من لە یەکەمین شەوی یەکتر ناسینمانەوە، هەستم بەو تەمە فیگارییەی سەر رووی میسیۆ لووسیانا کرد.

هەرگیز نەمدەتوانی تێ بگەم کە بۆچی جاربەجار لەکاتی گفتوگۆکانماندا، تەمی نائومێدییەک، لەناکاو رووی شادی ئەو پیاوە قۆز و پایەدارەی دادەپۆشی، کە لەرووی داراییەوە مسیۆ لووسیانا لە هیچ شتێکیشی کەم نەبوو.

پیاوێکی گەنجی زۆر قۆز، نووسەرێکی ئەکادیمی، زۆر دەوڵەمەند، قوتابیی دوکتۆرا لە زانکۆی سۆربۆن، خاوەن سێ هوتێلی لووکس - هەر یەکەیان لە پایەتەختێکی جیاوازی دنیا! ئایا باندەستی مردنی باوکی بوو؟ ئایا هەستێکی کافکایی و نادیاری جوولەکانە بوو؟ ئایا کۆستی عەشقێک بوو یان جودابوونەوەیەک، یان سەرچاوەکەی لە نەخۆشییەکی کوشندەوە هەڵقووڵابوو؟

بەردەوام لە خۆمم دەپرسی: بۆچی جاربەجار لەکاتی گفتوگۆکانماندا لەناکاو تەمی ئەو نائومێدییە قووڵە، رووی شادی ئەو پیاوە قۆز و پایەدارە دادەپۆشێ؟

ئەگەر مسیۆ لووسیانا خۆی رۆژێک هەندێ شتی بۆم باس نەکردایە، من هەرگیز هیچ شتێکم لەبارەوە نەدەزانی و نەشمدەتوانی -ئەسڵەن لە رووم نەدەهات- هیچ پرسیارێک لەم بارەیەوە بکەم.

- باپیرە گەورەکانی من کۆیلەفرۆش بوون.

بەم قسەیەی مسیۆ لووسیانا ڕاچڵەکیم. گوتم: (چی) بوون؟!

گوتی: کۆیلەیان دەکڕی و دەیانفرۆشتەوە.

پاشان گوتی:

- هەر لە سەدەی شازدەمەوە زۆربەی وڵاتانی ئەفریقا و هەندێک لە وڵاتانی ئاسیاش ژێردەستەی وڵاتی پورتوگاڵ بوون. باپیرە گەورەکانی من بۆ بازرگانیکردنی کۆیلە دەچوونە ئەفریقا؛ عەبد و قولەڕەشەکانیان لە وڵاتانی ئەفریقا دەکڕی و دەیانبردنە وڵاتانی ئاسیا و ئەوروپا لەوێ بە گرانتر دەیانفرۆشتنەوە.

ئنجا نەختێک بێدەنگ ما و لێمی پرسی:

- هیچت لەبارەی (فرانسوا گزاڤیێی قەدیس) خوێندووەتەوە؟

گفتوگۆکانی من و مسیۆ لووسیانا بۆ ماوەی نزیکەی ساڵێک تەنیا لەناو هۆڵی پێشوازیی هوتێلەکەدا بوو، ئەمەش هەمیشە لە دەوروبەری سەعات نۆی شەو بەمەلاوە: بەدیار قاوە و چایەکی سەوزی سایگۆنییەوە، کە مسیۆ لووسیانا لە درەنگ وەختانی شەودا زۆر حەزی لەم جۆرە چایە سایگۆنییە دەکرد.

گوتم: نەخێر، نایناسم.

- فرانسوا گزاڤیێی قەددیس، لە (١٥٠٦)، پاش خوێندنی ئیلاهیات لە پاریس، دەبێتە ئەندامی یەسووعییەکان. ئنجا پاشای پورتوگاڵ لەگەڵ شاندێک دەینێرێتە هیندستان بۆ بڵاوکردنەوەی دینی مەسیحیەت بە وڵاتانی

ئاسـیـادا. لە هیندسـتـانـەوە چالاکیـیـەکانی خـۆی لە سـەرانسـەری ئاسـیـادا بڵاودەکاتەوە تا دەگاتە ژاپۆن، ئنجا لە ١٥٥٢ لە چین دەمرێ.

من بە چاو لە مسیۆ لووسیانام پرسی:

– ئنجا بۆچی باسی ئەم قەدیسەت بۆ کردم؟

گوتی:

– یەکێک لە باپیـرە گـەورەکـانی من، بە ناوی (دیڤین شـالۆن)، کـە ئەویش قـولەڕەشـەکـانی ئەفـریقـای دەکـڕی و دەفـرۆشـتـەوە، لەو سـاڵەدا بەگـەڵ ئەم قـەدیسـە کەوتووە؛ خـۆی وا نیشـان داوە کـە ئەویش لە مـوریدەکانی فـرانسـوا گزاڤیـێـی قەددیسـە.. بەگەڵی کـەوتووە بۆ هیندسـتان. باوکم دەیگوت: «پاشا پورتوگـاڵیـیـەکـانی ئەو سـەردەمـە هـەمـوویان زۆر ڕقـیـان لە جـوولەکـە بووە، فـرانسـوا گـزاڤیـێـی قـەددیس باش دەیزانـی کـە ئەو باپیـرە گـەورەیەی من جـوولەکەیە و بازرگانیشـە، بەڵام چونکە (فـرانسـوا گـزاڤیـێ) قـەدیس بووە و هـەمـیشـە بەزەیی بە جـوولەکـەدا هاتووەتەوە و دەشـیـزانی پاشـای پورتوگـاڵ ڕۆژێک هـەر دادێ ئـەو باپیـرەیەی من شـاربەدەر بکا، بۆیە لـەگـەڵ شـاندەکـەی خۆی بردوویەتی بۆ هیندستان».

مسیۆ لووسیانا دەیگوت:

– پورتوگـاڵییـەکانی هـاوشـاندی فـرانسـوا گـزاڤیـێـی قـەدیس لە سـەدەی شـازدەمـدا لە هیـندسـتـان کـڵێـسـایەکیـان لە شـاری (گـووا) بینا کـردووە. ئەم باپیرە گەورەیەی من، دیڤین شـالۆن، یەکێک بووە لەو پورتوگاڵییـە جوولەکانەی کـە ئەو وەخـتـە چوونـەتە هیندسـتـان و لەوێ کـڵێـسـەیەکـیان لە شـاری (گـووا) دروست کردووە.

مسیۆ لووسیانا دەیگوت:

– (دیڤین شـالۆن)ی باپیـرە گـەورەی من، هێندەی پێ ناچێ لـەو قـەدیسـە جودا دەبێتەوە و مۆڵەتی لێ وەردەگرێ کە لە هیندستانەوە بەرەو ئێران بەڕێ بکەوێ.

مسیۆ لووسیانا دەیگێڕایەوە:

– دیڤین شـالۆنـی باپیـرە گـەورەی من، بـەم شـێـوەیە، ڕوو لە شـاری (ئەسفەهان) دەکات و لەمە بەدوواوە ئیتر.. نیوەی تەمەنی خۆی لە ئەسفەهان بەسەر دەبا. لە بیرەوەرییەکانیدا نووسیویەتی کە ماڵەکەی لە ئەسفەهان لە گەڕەکی (چهارباغ) بووە بەرامبەر پردی (ئەڵلاوێردی خان).

«ئەو باپیرە گەورەیەی من لە ئەسفەهان کنێشتێک بۆ جوولەکەکانی ئەسفەهان دروست دەکات و سیناگۆگە جوولەکەکان لەوێ لە دەوری خۆی کۆدەکاتەوە. بەم شێوەیە لە ساڵی (١٥٠٩) بەملاوە هەرچی جوولەکەی ئەسفەهان هەن لە دەوری کۆ دەبنەوە و دەبن بە مریدی.

دیڤین شالۆنی باپیرە گەورەم، سەبارەت بەوەی کە خۆی بەقەدەر وەزیرێکی شا ئیسماعیلی سەفەویی ئێران پارەدار بووە و لە ئەسفەهان چەندین مرید و خزمەتکاری لەگەڵدا بووە، هەرچی کتێب و بەڵگەنامە و کەشکۆڵی کەنیشتەکانی ئێران هەن لەبارەی یەهوودییەت و جوولەکەکانی ئاسیا، دەیانکڕێ و لەناو کنێشتەکەی ئەسفەهاندا کۆیان دەکاتەوە. ئەم کەنیشتە ئەمڕۆ لە ئەسفەهان ناوی بەیت لەحم و هێشتاش هەر ماوە. وەک گوتم جاران کەنیشتەی جوولەکەکان بوو، بەڵام ئەرمەنییەکانی قەزای (جولفە) بە سەرۆکایەتیی (خواجە پەترۆس ڤەلیژانیان Velijanian ) هاتن کردیان بە کەنیشتە. سێ کەنیشتەی تریش بە ناوی (سانت جۆرج) و (ڤەنەک) و (مریەمی موقەدەس) تاکو ئەمڕۆش لە ئەسفەهان ماون.. هەندێ سەرچاوە دەڵێن کە ئەو باپیرە گەورەیەم دەستی لە دامەزراندنی ئەوانیشدا هەبووە، بەڵام هەندێ سەرچاوەی کتێبخانەی ڤاتیگان دەڵێن کە نەخێر تەنیا پێوەندی و ئاڵوگۆڕی دەسنووس و بەڵگەنامە لەنێوانیاندا هەبووە و بەس».

مسیۆ لووسیانا دەیگوت:

– هەر چۆنێک بێ، بە گەواهیی هەموو مێژوونووسەکانی ڕۆژئاوا، ئەم کەنیشتەی بەیت لەحمی ئەسفەهان وەختی خۆی گەورەترین ئارشیفخانەی

جوولەکەکانی ئێران بووە، کە پڕ بووە لە بەڵگەنامە جاسووسییەکان لەبارەی ژیانی جوولەکەکانی وڵاتانی ئاسیا. ئەو بەڵگەنامە و ئەرشیفانە تاکو ئەمڕۆش هەر لەناو ئەو کەنیشتەیەی ئەسفەهاندا دەبێ پارێزراو بن.

من لە کاتێکدا زۆر سەرسام بووم بەرامبەر بەو هەموو زانیارییانەی کە مسیۆ لووسیانا لەبارەی ڕەچەڵەکی خۆی دەیزانین، لە هەمان کاتیشدا لە خۆمم دەپرسی:

– باشە، ئەم پیاوە بۆچی لەم بابەتە مێژووییە کۆن و بەسەرچووانەی باوباپیرانی جوولەکەی خۆی دەکۆڵێتەوە؟ ئەم جۆرە تۆژینەوە مێژووییانە چ سوودێکیان بۆ خۆی یان بۆ قەومی جوولەکە هەیە ئەمڕۆ؟

زۆربەی جاران لە وەڵامی ئەم پرسیارانەدا بە خۆمم دەگوت کە لەوانەیە ئەم گەڕان و تۆژینەوانە بەشێک بن لە ئەرکی زانستیی ئەم جۆرە پیاوە ئەکادیمییانە.

مسیۆ لووسیانا دەیگوت کە تەنیا برێکی زۆر کەم لەو دەسنووسانەی باپیرە گەورەکەی، ئەمڕۆ لە کتێبخانەی (ڤاتیگان) لە ئیتالیا پارێزراون و ئەم توانیویەتی تەنیا چەند تیکەیەکی زۆر کەم لەو نووسراوانە کۆپی بکات و لێیان بکۆڵێتەوە. ئەمەش دووای ئەوەی کە مسیۆ لووسیانا بە هەزار حاڵ توانیویەتی خۆی لەگەڵ ئافرەتێکی فەرمانبەری ئەرشیفخانەی ڤاتیگان بکاتە برادەر، کە کچێکی قولەڕەشی بەئەسڵ خەڵکی (زائیر) بووە؛ چونکە بەپێی فەرمانی ڕێڤەبەری ئەرشیفخانەی ڤاتیگان هیچ کەس بۆی نەبووە ئەم بەڵگەنامە دێرینانە کۆپی بکات، بەڵام مسیۆ لووسیانا چونکە توانیویەتی خۆی لەگەڵ کچە قولەڕەشە ئەفریقییەکە بکاتە برادەر و خۆی لێ نزیک بخاتەوە – هێدی هێدی، دووای پێنج مانگ دۆستایەتی و بانگهێشتن و پاشان مغازەلە و لە کۆتاییشدا چوونە دەرەوە و پێکەوە نوستن – ئەنجاغ توانیویەتی چەند لاپەڕەیەکی کەم لە دەستی ئەو کچە زائیرییەوە وەربگرێت و کۆپییان بکات و پاشان وتارێکی ئەکادیمییان لەسەر بنووسێت و پاشان لە گۆواری

(ستـەدیکا)ی تایبـەت بە تۆژینەوە نێـونەتەوەییـیـەکـانی ڕۆهـەڵاتنـاسـی بڵاوی بکاتەوە!

مسیۆ لووسیانا دەیگوت:

– لە یەکـێک لەو دەسنووسـانەی ئەو باپیـرەیەمـدا نووسـراوە کـە خـەڵکی جـوولەکـەی گـەڕەکـەکانی دەوروبەری منـارەی (چهل دوختـەران) کـە دەکـەوێتـە نزیک مـــەیدانی (هەشت بـەهەشـت) لە ئەسـفـــەهـان، بە ســوودوەرگــرتن لە بنچینـەکـانی هونەری پیشـەسـازیی چین، تاکو سـەدەی پازدەمـینیش لقـە دار تووی سپییان دەهێنا دەیانشێلا و کاغەزیان لێ دروست دەکرد.

مسیۆ لووسیانا دەیگوت:

– دیڤین شالۆنی باپیرە گەورەم، لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا نووسیویەتی.

«کاتێ گەیشتمە ئەسفەهان، هاتم ئەم پیشەسازییـەی دروستکردنی کاغەزم لە لقـە دارتووی سپییەوە بووژاندەوە و پەرەم پێی دا. جوولەکەی گەڕەکەکانی دەوروبەری منارەی (چهل دوختـەران)م کۆکردە و خستمنەوە سـەر کـەڵکەڵەی دروستکردنی کاغەز. چونکە دەمزانی تەنیا لە شاری قەندەهار و لە وڵاتی چین بایەخ بەم پیشە گرینگە دراوە. ئیتر وای لێ هات جوولەکەکانی ئەسفـەهان، ئەوانەی لـە کـارگـەکـانی مندا کـاریان دەکـرد، بە سـواری حـوشـتـری پێست ئەستووری سم پانەوە بەرەو سنوورە شـاخاوییەکانی ناو بەختیارییەکان، هیچ هەفتـەیەک نەبوو لە سێ بار حـوشـتر کـەمتر کاغەز نـەفرۆشنە ئەو بازرگانە تورکانەی کە لە ئەستەمبـۆڵەوە دەهاتنە ئێران کاغەزیان بۆ دەرباری سوڵتان و وەزیرەکانیان دەکڕی و دەیانبردنەوە بۆ وڵاتی خۆیان».

مسیۆ لووسیانا دەیگوت:

– لەلایەک ئەم دەسـنووس و یادەوەرییـــانەی ئەو باپیـــرەیەم، لـەلایەکی دیکەشـەوە کتێب و بەڵگەنامـە جاسـووسیـەکان لەبارەی ژیانی جـوولەکـەکانی ئێـران، کـە دەڵێن تـا سـەرەتـای سـەدەی بیسـتـەمـیش لەلای سـیناگـۆگـە جـوولەکەکانی ئەسفەهان پارێزراو بوون.. منیان ئەمڕۆ مـەست و سەرسـامی

ئێران کردووە؛ خستوومیانەتە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی کە ڕۆژێک بتوانم بچم بۆ ئەسفەهان.

مسیۆ لووسیانا زۆر حەزی دەکرد بچێتە ئەسفەهان:

- بەڵێ، چونکە کتێبخانەیەکی زۆر کۆنی باپیرە گەورەمی لێیە و بەڵگەنامە جاسووسییەکانی تێدا پارێزراوە لەبارەی ژیانی جوولەکەکانی وڵاتانی ئاسیای ئەو زەمانە.

مسیۆ لووسیانا دەیگوت:

- پیەترۆ دێلا ڤاللای گەڕۆکی ئیتاڵی و شوڤالیێ شاردانی گەڕۆکی فەرەنسیش Chardin کە لە ناوەڕاستی ساڵانی (١٦٠٠)دا چوونەتە ئەسفەهان، تەنانەت ئیبن بەتووتەی مەغریبیش کە لە (١٣٣٠)دا سەردانی ئەسفەهانی کردووە.. هەموویان.. باسی ئەم بەڵگەنامە و دەسنووسانەیان کردووە و دەڵێن کە لە کەنیشتەکانی (سانت جۆرج) و (مریەمی موقەدەس) بە چاوی خۆیان دیویانە.

مسیۆ لووسیانا هەمیشە بە تاسووق و مگێزەوە دەیگوت:

- ئەگەر بمتوانیبا بچم بۆ ئێران، بێگومان دەمتوانی ئەو کەنیشتە ناودارەی باپیرە گەورەی خۆم لە ئەسفەهان بدۆزمەوە و بکەومە سەر پەیداکردنی (هیچ نەبێ برێک) لەو کتێب و بەڵگەنامە گرینگانە.

مسیۆ لووسیانا دەیگوت:

- لە سەرەتادا دامنابوو تەنانەت تێزی دوکتۆرانامەکەشم هەر لەسەر ئەم بەڵگەنامە و دەسنووسانە بنووسم، بەڵام دەمزانی کە ناتوانم وا بەئاسانی و بەم زووانە سەردانی ئێران بکەم.

مسیۆ لووسیانا هەمیشە دەیگوت:

- سەردانی ئەسفەهان بۆ من خەونێکە!

بشنو از نی چون حکایت میکند

و از جدائیها شکایت میکند

مسیۆ لووسیانا بە تاسووقەوە، چاوەکانی پڕ لە خەون، دەیگوت:

– هەندێ جار خەون دەبینم «چوومەتە ئەسفەهان.. پاڵتۆیەکی سووری زستانەم لەبەرە و بەتاقی تەنیا، لەگەڵ گەردوگۆڵی بەیانیدا، لە هوتێلی (عالی قاپوو) دێمە دەرەوە و بە بەردەم ئارامگای (باباقاسم) تێپەڕ دەبم، زۆر دڵخۆش، لە منارە ناودارەکەی (سارەبان) و (دارلزیافە) ورد دەبمەوە، کە یەکەمیان لە سەردەمی سەلجووقیەکان و دووەمیشیان لە سەردەمی ئێلخانییەکاندا دروست کراوە. ئنجا بەناو خیابانی (چهار باغ)دا کە جاران جێگەی پیاسە و سەیرانی ئەندامانی بنەماڵەی شاعەبباسی سەفەوی بووە، تێر تێر دەڕوانمە ئاوە جوانەکەی (زاینده رood). تا ئیتر ئەو زێبارە بچووکە دەمگەیەنێتە پردی (سی و سە پل). پاشانیش لەوێوە ئاراستەی پیاسەکردنی خۆم دەگۆڕم بەرەو بینینی مزگەوتە جوانەکەی (جارچی باشی) کە کەوتووەتە ناوەڕاستی بازاڕە گەورەکەی ئەسفەهان.

مسیۆ لووسیانا دەیگوت:

– هەموو ئەمانەم لەناو بیرەوەرییەکانی باپیرەگەورەمدا خوێندووەتەوە.

شەوێک لە مسیۆ لووسیانام پرسی:

– تۆ لەلایەکەوە هێندە شەیدای ئەسفەهان و ئەو ئەرشیفخانە کۆنەی باپیرە گەورەت لە ئەسفەهان، لەلایەکی دیکەوە هێندە متووی ئەدەبیاتی ئێران؛ چۆنە بیرت لەوە نەکردووەتەوە سەردانێکی ئێران بکەیت؟

مسیۆ لووسیانا تەماشایەکی کردم، گوتی:

– ناوێرم.

– بۆ ناوێریت؟

مسیۆ لووسیانا ئەو شەوە وەڵامی نەدامەوە بۆچی ناوێرێت بچێتە ئێران؛ بەڵام درەنگتر (دووای ئەوەی کە زۆرتر متمانەی ئەوم لەلای خۆم دروست کرد) تێی گەیاندم کە ئەو، دەیان جار چووەتە ئیسرائیل و چەندین ڤیزەی یەک بەدووای یەکتری ئیسرائیل بەسەر پەساپۆرتەکەیەوە هەیە.. بۆیە بە هیچ شێوەیەک جەسارەت ناکا، وەک خۆی دەیگوت «جوولەکەش بێت و دەیان جار سەردانی ئیسرائیلیشی کردبێت» ریسک بکات و بچێ خۆی بسپێرێتە ناو زیندانەکانی کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە!

ڕاستیشی دەکرد؛ مسیۆ لووسیانا چەند مانگ جارێک دەچووە تەلئەبیب، چونکە هوتێلێکی سێ ئەستێرە و دەرمانخانەیەک و چەندین خانووبەرەیان لەوێ هەبوو (دەچوو بۆ وەرگرتنی کرێ و پاککردنەوەی حیسابەکانیان لەوێ)؛ بەڵام من تا ئەو ڕۆژە نەمدەزانی ئەگەر پەساپۆرتەکەت ڤیزەی ئیسرائیلی بەسەرەوە بێت، لە ئێران دەتگرن و دووای لێپێچانەوە حەپسیشت دەکەن!

(دووای بیستنی ئەم زانیارییە، پرسیاری ئەم مەسەلەیەم ڕۆژێک لە محەمەدی حاجی زادە کرد، ئەویش دەمودەست ئەم ڕاستییەی پشتڕاست کردەوە:

– بەڵێ بێگومان، ئەگەر ڤیزەی ئیسرائیل بە پەساپۆرتەکەتەوە هەبێ، ئەوا بێگومان لە ئێران مانای وایە کە تۆ (جاسووس)ی ئیسرائیلیت.. حەپست دەکەن.

ئنجا گوتی:

– هەرچۆنێک بێ، بەلای کەمەوە، گومانت دەخەنە سەر و (تووش) دەبیت.

ئیتر مسیۆ لووسیانا زۆر مەرەقی بوو، تەنانەت مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی ڕۆژێک هەر بتوانێ سەردانی ئێران بکات:

– هەتا دەمرم.. یەکێک لە ئاواتە گەورەکانم ئەوەیە کە ئەم ڕێژێمە

دکتاتۆرییەی ئێران برووخێت.. بۆئەوەی بمتوانیبا، ئەگەر بۆ تەنیا ڕۆژێکیش بێت ئەسفەهان ببینم.. بۆ تەنیا ڕۆژێکیش بێت وڵاتی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی ببینم!

مسیۆ لووسیانا تا ئەوکاتە سێ جاران تایبەت سەردانی شاری (قۆنیا)ی لە تورکیا کردبوو تەنیا لەبەرئەوەی لە دەوروبەری ساڵی (١٢٥٠) مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی ماوەیەک لەوێ ژیاوە و (بە قسەی ئەو) دەیگوت کە هەر لەوێش جوانترین شیعرە عاشقانەکانی خۆی نووسیوە:

– بشنو از نی چون حکایت میکند

و از جدائیها شکایت میکند..

مسیۆ لووسیانا پێشتریش چەندین جار ئەم شیعرە ناودارەی مەولانای، بە هەمان ئاواز و زمانە ئەسڵییە فارسییەکە – خۆی بۆم خوێندبووەوە. زۆر حەزم لێ بوو کە بۆمی دەخوێندەوە، چونکە هەمیشە دەیتوانی ئاوازە سیحراوییەکەی شیعرەکە بەوپەڕی وردبینییەوە – لە مۆسیقاژەنێک زۆر کارامەتر دەرببڕێ. لە کۆتاییی هەر خوێندنەوەیەکیشدا هەر جارێک بۆچوونێکی تازەی، کە من پێشتر نەمبیستبوو لەبارەی شیعرەکەوە یان لەبارەی مەولاناوە بۆم باس دەکرد و ڕای دەچڵەکاندم.

– من واتێ دەگەم مۆسیقای ئەسیلی ئێرانی، لە وەزنی شیعرەکانی مەولاناوە سەرچاوەی گرتووە!

مسیۆ لووسیانا دەیگوت:

– بۆ سەلماندنی قسەکەم، تەماشای مۆسیقای ئەم شیعرە بکە:

ای نور ما، ای سور ما، ای دولت منصور ما

جوشی بنه در شور ما، تا میشود انگور ما

ای دلبر و مقصود ما، ای قبله و معبود ما

اتش زدی در عود ما، نظاره کن در دود ما

ڕاستییەکەی؛ من دیسان هەر لە مسیۆ لووسیاناوە بوو کە چیرۆکی عەشقی نێوان مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی و شەمسی تەبرێزیم بیست و تاساندمی! پێش ناسینی مسیۆ لووسیانا، بەڕاستی؛ من هەرگیز بەسەرهاتە پڕ لە ئەفسوونەکانی نێوان مەولانای ڕۆمی و شەمسی تەبرێزیم نەخوێندبووەوە، هەر نەشمبیستبوو. مسیۆ لووسیانا زۆربەی شیعرەکانی حافز و مەولانا و خەیام و نیمایۆشیج و فرووغی فەروخزادی لەبەر بۆم دەخوێندەوە.

من بەلامەوە بەڕاستی زۆر سەیر بوو؛ پیاوێکی گەنجی فەرەنسی، تۆژەرێکی ئەکادیمی، خاوەن سێ هوتێلی لووکس (لە پاریس و ئۆکسفۆرد و تەل ئەبیب)، بەئەسڵ جوولەکەی پورتوگاڵی؛ هێندە ئەویندارى حافز و مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی، هێندە شەیدای کولتووری ئێران!

«خۆزگە بمتوانیبا سەردانی مەزارگەکەی حافز بکەم!».

«دۆزینەوەی کەنیشتەکەی باپیرم لە ئەسفەهان، بۆ من خەونێکە!».

زۆربەی ئەو شەوانەی کە دەهاتە لام و لە هۆڵی پێشوازیی هوتێلەکە دادەنیشتین گفتوگۆمان دەکرد؛ بە حەسرەت و شەیداییەکی قووڵەوە.. هەمیشە ئەم ئاواتەی دووبارە دەکردەوە مسیۆ لووسیانا.

## گەرموگوڕییەک

## کە لە عەشقی ڕۆهەڵاتیدا هەیە

مسیۆ لووسیانا مانگی جارێک دەچووە ئۆکسفۆرد، چەند مانگ جارێکیش دەچووە تەلئەبیب. دەیگوت:

«دەچم قازانجی مانگانەی هوتێلەکانمان وەردەگرم و حیساباتی خانووبەرە و کرێ و پارەی دیکەمان لەوێ هەن یەکلاییان دەکەمەوە. دایکم جاران بەخۆی دەچوو، بەڵام ئێستا پیر بووە و ئەم هاتوچۆیە بە ئەو ناکرێ».

مسیۆ لووسیانا، تەنیا خۆی و دایکی لەناو بنەماڵە جوولەکە بەئەسڵ پورتوگالییەکەیاندا مابوونەوە. دوو مامی و خاڵێکی، هەروەها برایەک و خوشکێکی لەخۆ گەورەتریشی.. هەموویان.. لە ئاخرین ساڵی شەڕی جیهانیی دووەمدا، بەدەستی نازییەکان - بەتاوانی جوولەکەبوونیان - قەتڵوعام و بێ سەروشوێن کرابوون. باوکی لووسیانا تەمەنی پەنجا ساڵ دەبێ، دایکیشی چل ساڵ، کاتێ لووسیانای تاقانە کوڕیان لەدایک دەبێ.

لووسیانا دەیگوت:

- لە دوای دایکم، من ئاخرین و تاقە کەسێکی بنەماڵەکەمان دەمێنمەوە.

لێم پرسی: «بۆچی ژن ناهێنێت، بەڵکو لە ئێستاوە نەوەیەک بۆ خۆت بنێیتەوە!».

پێ کەنی، گوتی: کاری دیکەم هەن ئەنجامیان بدەم.

لووسیانا، قوتابیی دوکتۆرا، هەفتەی تەنیا ڕۆژێک لە زانکۆی نانتێغ Nan-terre وانەبێژ، هیچ کارێکی دیکەی نەبوو؛ لەم سەفەر و هاتوچۆیانەی زیاتربەرەو تەلئەبیب و ئۆکسفۆرد:

– بەڵام کاتێ بۆ سیمینارەکانم دەچمە بەرلین یان مۆسکۆ زۆربەی جاران دایکیشم لەگەڵ خۆم دەبەم. زۆر کەیفی دێ کە دەمبینێ لەسەر سەکۆی ئەکادیمیدا توێژینەوەکانی خۆم دەخوێنمەوە.

هەر جارێک مسیۆ لووسیانا بچووایە بۆ تەلئەبیب یان بۆ ئۆکسفۆرد، پێشوەختە بە چەند ڕۆژێک ئاگاداری دەکردمەوە.

– چەند ڕۆژێکی دیکە دەڕۆم، فەرهاد.. ئاگاداری دایکم بە!

لەو ساڵانەی دواییدا، جارێکیان کاتێ لە تەلئەبیب گەڕایەوە ئەلبوومێکی گەورەی نیگارکێشە ئیسرائیلییەکانی بۆم بەدیاری هاوردبوو. سوپاسیم کرد کە منی لەوێ لەبیربووە.

ڕاستییەکەی، تابلۆی هونەرمەندەکان هێندە سەرنجیان ڕانەکێشام بەڵام لەکاتی تەماشاکردنی تابلۆی هونەرمەندە ئیسرائیلییەکاندا، شەو، لەناکاو شتێک هاتە خەیاڵم و گوتم ڕۆژێک پێی دەڵێم.

شەوێک لەو شەوانەی ناو هۆڵی پێشوازیی هوتێلەکەدا، مسیۆ لووسیانا پێکێک وێسکی و منیش چایەکی تیزانم لەبەردەم بوو؛ کەوتمە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی پێی بڵێم:

«حەزدەکەم دیاپۆزەتیڤی تابلۆکانی خۆمت پێ بدەم؛ ئەگەر خاوەن گەلەرییەکانی تەلئەبیب تابلۆکانم ببن و بڕیار بدەن لێمی بکڕن.. ئەو کاتە خۆم سەفەرێکی تەلئەبیب دەکەم و تابلۆکانی خۆمیان بۆ فرۆشتن بۆ دەبەم.

ئەگەر ئەم داخوازییەم لێی بکردایە، دەمزانی تەکلیفێک بوو؛ دووای ئەمەش – دەمزانی – یەکسەر تەریق دەبوومەوە؛ ئەمە جگە لەوەی کە لەوانەیە لە ئیسرائیل گەلەری و تابلۆفرۆشتن هێندە وەک پاریس ڕەواجی نەبێ.. تەنانەت ئەگەر من خۆیشم دوواتر ئەم هاتوچۆیەی تەلئەبیب یان ئۆکسفۆردم بکردایە، نرخی تابلۆکانم تەنیا بەشی باڵەفڕە و مانەوە و مەسرەفی ئەوێمی دەکرد». لەکۆتاییدا داواکەم لێی نەکرد، لەڕووم نەهات تەنانەت چیتر بیریشی لێ بکەمەوە.

مسیۆ لووسیانا لەو دەمەدا بوو لەناکاو گوتی:

– تۆ لەو ساڵەوەی ئێرانت جێ هێشتووە، قەت نەچوویتەوە بۆ ئێران؟

گوتم: نەخێر.

مسیۆ لووسیانا لێمی پرسی:

– قەت بیرت نەکردووەتەوە سەردانێکی ئێران بکەی؟

ئەوکاتە هێشتا ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١) لە کوردستان بەرپا نەبووبوو، سەدام حوسێن هێشتا لە حوکم بوو. گوتم:

– من هێندە حەز بە سەفەرکردن بۆ وڵاتانی ڕۆهەڵات ناکەم.

بە سەرسامییەکی گازاندەبارەوە، کە هەستم کرد ئەو گازاندەیە لە ئەوینێکی وییەوە بۆ ڕۆهەڵات سەرچاوەی گرتووە گوتی: بەڕاستتە؟!

گوتم: بەڵێ.

لەبەر خۆیەوە، کەمێک مەستانە، گوتی:

– هەر کەسێک بەدووای ئەو شتەدا وێڵە کە خۆی نیەتی.

خەریک بوو لێی بپرسم: «تۆ چیت نییە؟». لووسیانا پێکی وێسکییە سکۆتلەندییەکەی هەڵدا و گوتی:

– من بەو عەشقە ڕاستەقینەیە سەرسامم کە لە وڵاتانی ڕۆهەڵاتدا هەیە، ئەو گەرموگوڕییەی کە لە ئەوین و خۆشەویستیی ڕۆهەڵاتدا هەیە، تەنانەت لە پێوەندییەکانی نێوان مرۆڤە نزیک بەیەکترەکان لەگەڵ یەکتر.

کە ئەم قسەیەی تەواو کرد، یەکسەر، دیسان، تەمی هەستێکی فیگاریی قووڵ، کە لە نائومێدییەک دەچوو خووی پێوە گرتبێ، کەوتە سەر ڕووی؛ ڕۆحی مسیۆ لووسیانای کوژاندەوە. دوای ئەوە ئیتر.. هیچی دیکەی نەگوت.

قەیرێک هەر وا بێدەنگ، تەمی ئەو خەفەتە لەناکاوە لەسەر ڕووی؛ تەماشای ئەستێرەیەکی دووری دەکرد کە لە پەنجەرەکەی دەرەوەڕا – دەمدیت– لە

هەردووكمانەوە دیار بوو.

مەرەقم بوو بتوانم لێی بپرسم کە بۆچی جاربەجار لەکاتی گفتوگۆکانماندا لەناکاو تەمی ئەو نائومێدییە، ڕووی شادی ئەو پیاوە قۆز و پایەدارە دادەپۆشێ، کە لەڕووی دارایییەوە مسیۆ لووسیانا -دەمزانی- لە هیچ شتێکیشی کەم نەبوو!

پیاوێکی گەنجی قوتابیی دوکتۆرا لە زانکۆی سۆربۆن، خاوەن سێ هوتێلی لووکس - هەر یەکەیان لە پایەتەختێکی جیاوازی دنیا..! ئایا باندەستی مردنی باوکی بوو؟ ئایا هەستێکی کافکایی و نادیاری جوولەکانە بوو؟ ئایا کۆستی عەشقێک یان جودابوونەوەیەک بوو؟ یان سەرچاوەکەی، لە نەخۆشییەکی کوشندەوە هەڵقوولابوو؟ نەمدەزانی.

من زۆرم پێ ناخۆش بوو کە دەمدیت مسیۆ لووسیانا، ئادەمیزادێکی هێندە دڵ چاک و ڕۆشنبیر، نائومێدییەکی لەناکاو دڵی بکرۆژێت و ئاوها ڕۆحی بکوژێنێتەوە.

من بەرگەی فیگاریی ئەو پیاوە خاکەڕا و میهرەبانەم نەدەگرت. بۆ ئەوەی هیچ نەبێ تەمی ئەو خامۆشی و نائومێدییەی بڕەوێنمەوە؛ پێم گوت:

- من کەسێک دەناسم لەوانەیە بتوانێت بەڵگەنامەکانی ئەسفەهانت بۆ پەیدا بکا.

مسیۆ لووسیانا یەکسەر ڕاچڵەکی:

- کێ؟

چاوی گەش بووەوەوە:

- بەڕاستتە؟

گوتم: لەوانەیە بتوانێ یارمەتیت بدا.

- کێ؟ ..

ئنجا بە دڵخۆشییەوە گوتی:

– ئەدی بۆ پێی ناڵێی؟

گوتم: محەمەدی حاجی زادە.. هاورێ ئێرانییەکەم.

مسیۆ لووسیانا گەڕایەوە سەر دۆخی خۆی:

– ئەو مەلا ئێرانییەی کە دەڵێی بە من دەچێ؟

– بەڵێ.

– ئەو، بەڕاستی مەلایە؟

– بەڵێ.

مسیۆ لووسیانا جەختی کردەوە:

– مەلا؟

– بەڵێ. لە تاران مەلا بووە.

مسیۆ لووسیانا گوتی:

– ئنجا ئەو چۆن دەتوانێ یارمەتیی من بدا؟

بە مسیۆ لووسیانام گوت: لێی بپرسم؟

کاتێ دیتی من بەجیدیمە، ئەمجارە بەگومانەوە تەماشای پرسیارەکەی منی کرد:

– ئەو من دەناسێ؟

گوتم: نەخێر، تەنیا ئەوەندەم پێ گوتووە کە ئێوە هەردووکتان زۆر لەیەکتر دەچن.

وەک ئەوەی ئەمە یەکەمجاری بێت گوێی لەم قسەیەی من بووبێت، گوتی:

– ئەوە تۆ بەڕاستتە کە من و ئەو هێندە لەیەکتر دەچین؟

گوتم: هەر دەڵێی سێوێکن و کراون بە دوو لەتەوە.

– بەڕاستتە؟!

– هەر زۆر زۆر بەیەکتر دەچن.

گوتی: تۆ پێت گوتووە کە من جوولەکەم؟

گوتم: بەڵێ.

– دەشزانێ کە من کار لەسەر ئەدەبیاتی فارسی دەکەم؟

گوتم: بەڵێ.

– تۆ جارێکیان پێت گوتم کە لە حەوزەی تاران پلە و پایەیەکی بەرزیشی هەبووە.

گوتم: بەڵێ، لە فیقهی ئیسلامی و شەرع و علوومی ئیسلامیدا شارەزاییەکی زۆری هەیە. لە حەوزەی عیلمیی تاران وانەی (ئوسوولی عەقیدە)ی گوتووەتەوە.

مسیۆ لووسیانا بیری دەکردەوە. من دەمزانی حەزی نەدەکرد هیچ شتێک لەم بارەوە لای محەمەدی حاجی زادە بدرکێنم، گوتی:

– ئنجا مەلایەکی ئێرانی، ئەگەر بزانێ کە من جوولەکەم؛ چۆن؟

پێکی وێسکییەکەی هەڵگرت، پێش ئەوەی بینێ بەسەر دەمیەوە، بە خەمساردی و پێکەنینەوە گوتی:

– باوەڕ ناکەم مەلایەکی ئێرانی، ئەسڵەن هەر جەسارەت بکا لە (جوولەکەیەک) نزیک بکەوێتەوە...

من لەو دەمەدا بیرۆکەیەکی فەلسەفی هات بە خەیاڵما و ویستم پێی بڵێم: «ئەوروپا هەمیشە پێویستی بە ڕۆهەڵات هەیە. خۆ ڕۆهەڵاتیش پێویستی بە ئەورووپا هەیە». لەجیاتی ئەم فەلسەفەیە گوتم:

– نا، ئەو لەو جۆرانە نییە.. باوەڕ بکە!

مسیۆ لووسیانا سەری نەخێری ڕاوەشاند و گوتی:

– وازی لێ بێنە!

ئەورووپاییەکان کە تێک دەشکێن

ئنجا بۆ ئاستی ئێمەی پەناهەندە دادەبەزنە خوارەوە

محەمەدی حاجی زادە سەبارەت بەوەی بێکار، تەنانەت دەتوانم بڵێم کە وەک لانەوازێک لە پاریس دەژیا؛ زۆربەی کات لە ماڵەوە دەنوست.. دەیگوت: «لە ماڵەوە هەمیشە دەنووم، هیچ نەبێ بۆ ئەوەی هێندە پارە بە بلیتی مێترۆ و پاس سەرف نەکەم».

گەلێک جار، نیوەشەوان درەنگ، لەناکاو تەلەفۆنێکی بۆ دەکردم بۆ هوتێلەکەم:

– ببوورە ئاغای فەرهاد.. ئەرێ ئەمڕۆ چەند شەممەیە؟

یان پێش نیوەڕۆیان لەناکاو تەلەفۆنی بۆ دەکردم و لە خەوی شیرین هەڵی دەستاندم و دەیپرسی:

– ببوورە ئاعای فەرهاد.. سەعات چەندە؟

بەم شێوەیە ئیتر جار بە جار، هیچ نەبووایە تەلەفۆنێکی لەم شێوەیەی بۆ دەکردم.

پێم سەیر بوو! ماوەی زیاتر لە مانگێک دەبوو محەمەدی حاجی زادە نەدەهاتە مۆنتماخت.. هیچ سەر و سەدایەکیشی نەبوو. ڕۆژێک بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ مورتەزا کرد و هەواڵی ساقی گوڵچینی خوشکی و تابلۆکانی خۆمم لێی پرسی؛ پاشان هەواڵی محەمەدی حاجی زادەشم لێی پرسی، کەچی ئەویش وەڵامی دامەوە.. گوتی:

– وەڵا ئێمەش، ماوەیەکی زۆرە نەماندیوە.

دوای ئەم ماوە کورتە، محەمەدی حاجی زادە کاتێ دەرکەوتەوە، جیاواز دەرکەوتەوە: پۆشتە و پەرداخ، بە ڕەنگ و ڕووتر، نەختێک قەڵەوتریش بووبوو. لە هەموو شتێک جیاوازتریش - لەچاو جاران - ئەوە بوو کە (پارەیەک) کەوتبووە باخەڵییەوە.

من پێم جوان نەبوو لێی بپرسم ئاخۆ چۆن ئاوها لەناکاو بووژاوەتەوە، چونکە دەمزانی تاکو ئەوساش (لە قاپشۆریی ناو ڕێستورانەکان زیاتر) هیچ کار و دەرامەتێکی دیکەی نەبوو بەستەزمانە.

لەو ماوەیەدا، ئێوارەیەک، لەناو (قاوەخانەکەی خۆمان) لە مۆنتماخت، ئەرشەدی قازی لەناکاو دەستی بە پێکەنین کرد:

- مەلا تارانییەکەی هاورێی فەرهاد بووە بە هۆمۆ.

کامیل هەرکە ناوی مەلای بیست، پرسی:

- بووە بە چی؟

- بووە بە هۆمۆ سێکسوێڵ.

قا.. قا، ئەرشەدی قازی ڕووبەڕووی هاورێ نیگارکێشە کوردەکانی، پێدەکەنی.

ئەرشەدی قازی، لەبەرئەوەی هەر لە یەکەمین هەفتەکانی دەسن پێکردنی شەڕی عێراق- ئێرانەوە هاتبووە پاریس؛ ژمارەیەکی زۆر لە پەناهەندە ئێرانییەکانی ناو پاریسی دەناسی و خەڵکانێکی زۆری ئێرانی «وەک خۆی دەیگوت لە پزیشک و پیاوماقووڵەکانەوە بگرە تا دەگاتە هۆمۆسێکوێڵەکان» هاورێی بوون.

یەکێک لە هاورێ ئێرانییەکانی ئەرشەدی قازی، کە ئەرشەد دەیگوت ناوی (فەرزین)ە و خۆیشی هەر هۆمۆسێکسوێلە و دەیەوێ بەم زووانە لەڕێگەی ڕێکخراوێکی هۆمۆسێکسوێڵەکانەوە بۆ نەشتەرکارییەکی تایبەت بۆ ئەوەی خۆی بکاتە ژن بچێتە لەندەن؛ لای ئەرشەدی قازی باسی کردبوو گووایە

پیــاوێکی پیــری هۆمــۆســێکســوێلی فــەرەنسی بە نـاوی (دونی Denis) لە گەڕەکـەکـەی خـۆیان لە (ئەرژەنتـۆی)، لەگـەڵ مـحـەمـەدی حـاجی زادە وا ڕێک کەوتوون کە ئەگەر هـەر جارێک محـەمەدی حاجی زادە سواری ئەو پیاوە هۆمۆ فـەرەنسـییـە دەبێ، کـابرای هۆمـۆی پیری فـەرەنسـی (سـەد و پەنجـا) فـرەنکی دەداتێ.

«ئەو پیاوە فەرەنسییە زۆریش دەوڵەمەندە».

من لەو دەمەدا ئـەرشـەدی قـازیم زۆر پیس و دڵڕەش هـاتە بەرچاو کاتێ بینیم هێندە مکووڕە لەسەر ناشیرینکردنی ئەو مەلا تارانییە بەدبەختە.

لە دڵی خـۆمـدا گـوتم: «پەنـاهـەندە چەند سـەیرە! هـەمـیشـە حـەزدەکـا کـە تۆ ڕۆژێک چورتمێکت بـەســـەر بێت بـۆ ئـەوەی خــەڵک بـۆی بســـەلمێت کـــە پەناهەندەیەکی لە خۆی نزمتر لە دنیا هەیە!».

ئەرشـەدی قازی گاڵتەی بە محەمەدی حاجی زادە دەکرد:

– تەواو ئیتر.. مەلا نانی کەوتووەتە ناو ڕۆنەوە.

قاقا پێ دەکەنی:

– هـەر جــارێک مــحـــەمــەدی حــاجی زادە، دووای ئەوەی ســواری پیــاوە دەوڵەمەنـدە فەرەنسییەکە دەبێ، پیاوە فـەرەنسییەکە (سەد و پەنجا) فرەنکی دەداتێ!

لە خۆمم دەپرسی: تۆ بڵێی ئەم قسەیەی ئەرشەد ڕاست بێ؟

پیاوێکی پیری دەوڵەمـەند لە فـەرەنسـا، ئاخـۆ تا ئـەو ڕادەیە بێکەس و تەنیا دەمـێنێـتــەوە کـە نـاچار ببـێت بۆ سـێکس لـە پەناهـەندەیەک بپــاڕێتــەوە و.. پارەیشی بداتێ؟!

بۆ نا؟ دەچووە عەقڵمەوە. بەڵێ.

– تۆ بزانە، پەراوێزبوونی مــرۆڤی ئەورووپایی گــەیشــتــووەتـە چ ڕادەیەک! ســیـســتــەمی وڵاتـانی ڕۆئاوا مــرۆڤـیــان دابـەزاندووەتە نـاو چ چڵـپــاوێکی

گۆشەگیری و تەنیاییی موتڵەقەوە!

(عەلی هادی) ئەمەی گوت.

ئنجا هەژار گوتی:

- پیاوێکی فەڕەنسیی.. (دەوڵەمەندیش!)، هەر جارێک سەد و پەنجا فرەنک بداتە پەناهەندەیەک، بەس بۆ ئەوەی چەند دەقیقەیەک لەگەڵی بێت و سێکسی لەگەڵ بکا!

- ئەمەیە ئەورووپا! ئەمەیە واقیعی مرۆڤە پەراوێزبووەکانی ئەورووپا!

من بیرم لە قسەکەی عەلی هادی دەکردەوە: تۆ بزانە، سیستەمی دەوڵەتەکانی ڕۆئاوا مرۆڤیان دابەزاندووەتە ناو چ چڵپاوێکی گۆشەگیری و تەنیاییی موتڵەقەوە!

محەمەدی حاجی زادە، پیاوێکی ئێرانیی خاوەن کولتوورێکی ئیسلامی و پارێزگار، جاران مەلای مزگەوتی زەینەبە لە تاران، لەسەر بۆچوونە سیاسییەکانی لەلایەن ڕژێمی کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە خەلعی لیباسکراو، بێت - تەنیا لەپێناو ئەوەی کە لەدەست بێ پارەیی و سەمەرگیی ژیانی هەژاری ڕزگاری ببێت!- ڕازی ببێ بچێت لەگەڵ هۆمۆسێسکوێڵێکی دەوڵەمەندی پاریس سێکس بکات!؟

من لە سەرەتادا هەرگیز باوەڕم بەم قسەیە نەدەکرد.

نیگارکێشە کوردە هاوڕێکانم، هەر یەکەیان قسەیەکیان دەکرد و حاڵەتەکەیان بەشێوەیەکی جیاواز لێک دەدایەوە.

کامیل دەیگوت:

- ئێ کاکە، مەلای بەستەزمان سێ ساڵ زیاترە لەم پاریسە، بەبێ ژن و ماڵ دەسووڕێتەوە، بەبێ ئەوەی تاکو ئێستا هەر دەستیشی بەر هیچ ژنێک کەوتبێ. ئەدی چ بکا!

عەلی هادی دەیگوت:

– پیاو بەبێ ژن لەم پاریسە بێ دەرپێیەدا یان ئەوەتا شێت دەبێ، یانیش ئەمەتا ناچار دەبێ سواری قووندەرەکانیان ببێ.

پشتیوان دەیگوت:

– بەستەزمانە؛ مرد هێندەی هەر وەکو سەگ تەنیا پاشماوەی ناو چێشتخانەکان بخوا.

ئەرشەدی قازی دەیگوت:

– ..مەلا نانی کەوتووەتە ناو ڕۆنەوە.

بەڵام هەژار دەیگوت:

– ئەم قسەیە ئەگەر ڕاستیش بێ، من باوەڕ ناکەم مەلا لەتاو گەڵ و گونی خۆی ڕووی کردبێتە ئەم بەزمە.

– ئەی چی؟

– مرد هێندەی وەکو سەگ لەناو ڕێستورانتەکاندا تەنیا بەرماوەی میوانان بخوا.

– واتە بۆ پارە سواری ئەو پیاوە دەبێ؟

– من دڵنیام. چونکە پێویستی بە پارەیە.

– خۆ ئەگەر بۆ سێکسیش بێت، زەواجی سیغەیە.. بۆ نا؟

– لەوەتەی هاتووە بۆ پاریس، باوەڕ ناکەم دەستی بەر دەستی هیچ ژنێک کەوتبێ.

– تەنانەت بۆنی هیچ ژنێکیش.

– کەواتە هەقیەتی.

– ئەگەر بۆ پارە بێ، یان بۆ هەوەسی خۆی.. ئێمە کارمان بەسەریەوە چییە؟

– پێم وابێ مووچەی بێکاریی بەلەدیەش وەرناگرێت. وا نییە؟

– نا.

– بۆ سێکس نییە ئەم کارە دەکا.. پێویستی بە پارەیە.

مەلایەک، کە جاران هێندە شانازیی بە کولتووری ڕەسەنی ئێرانەوە دەکرد و هێندە پابەندی نەریت و بنچینەکانی ئیسلام؛ چۆن لەپێناو (پارە) سواری هۆمۆسێکسوێڵێکی فەڕەنسی دەبێ؟!

من باوەڕم نەدەکرد.

ئەرشەدی قازی ئێوارەیەکی تر، بە هەمان ئاوازی گاڵتەئامێزانەی خۆی، گوتی:

– پێری ئێوارە هەردووکیانم لە بەردەم سینەما ئۆدیۆن، لای مێترۆکەی ئۆدیۆن بینی. بەپێش پیرەمێردەکە کەوتبوو، دەستی گرتبوو دەیبرد بۆ سینەما. پاشان هەر سەیرم کردن و بەدیاریانەوە نەختێک ڕاوەستام، چوون ڕیزەیان گرت بۆ ئەوەی پێکەوە بچنە سینەما.

– پێکەوە دەچن بۆ سینەماش؟!

– بە چاوی خۆم دیتم، مەلا بۆ ماوەیەکی کەم لە ڕیزەکە چووە دەرەوە و چوو (کرێپ)ی بۆ بکڕێ. کرێپێکی بۆ خۆیشی هێنا. لەناو ڕیزەکەدا، بەدەم چاوەڕێکردنی بلیتی سینەماوە، جوان جوان لەبەردەم سینەمای (ئای ماکس) ڕاوەستابوون پێکەوە کرێپیان دەخوارد. بەس بتاندیبا پێکەوە چەند جوان بوون!

من تەماشای پێکەنینە گاڵتەجارییەکەی ئەرشەدی قازیم دەکرد، لە دڵی خۆمدا گوتم: «هەندێک جۆر بەختەوەری هەیە، مرۆڤ چونکە بۆ خۆی ناتوانێ دەستی بیگاتێ، حەسوودیی پێ دەبات و دێ مانای ئەو بەختەوەرییە نەگریس دەکا».

– قەناعەت و ژیانی خۆیەتی. تۆ کارت بەسەریەوە چییە.. ئەرشەد؟

پشتیوان ئەمەی بە ئەرشەد گوت.

– باشـه.. بەڵام (مـەلا) با چیتر مـزایەدەی دینی ئیسـلام و ڕەوشـتی و ئەم شتانەمان بەسـەرەوە نەکا. تۆ بەبیرتە جاران چیی دەگوت؟ بەبیرتە جاران چ مزادەیەکی ڕەوشتی و دینی ئیسلامی بەسەر ئێمەوە دەکرد؟!

– وایە.

– بەبیرتـە جارێک بە توورەیییـەوە گـوتی: «پاراسـتنی کولتـوور و ڕەوشـتی ئیسلام ئەمڕۆ لە نوێژ و ڕۆژوو زۆر گرینگترە بۆ ئێمەی موسڵمان»؟

– جـاران جـاران بوو. هەر کـەسێک، لە هەر قـۆناغێکدا شـتێکە؛ پاشـان گـۆڕانی بەسـەر دادێ. ئەوروپا ئـاوهایە ئیـتر، فـریشـتـەیـەک لە مـاوەی چەند ساڵێکدا دەکاتە ئیبلیس؛ ئیبلیسێکیش بەپێچەوانەوە دەکاتە فریشتە. تۆ پێش ئەوەی بێیتە پاریس.. ئایا ئەمە بووی کە ئێستا هەیت؟!

ئەم قسـانەی کـە پشـتیـوان بە ئەرشـەدی گوت، زۆر ڕاست بوو: مـحـەمـەدی حـاجی زادە جـاران، واتە سـێ چوار سـاڵێک پێشـتـر، پیـاوێکی زۆر داخـراو، پابەنـدی نەریت و دین و ڕەوشـتی گـشـتی؛ بەڵام وردە وردە – منیش هـەسـتم پێی دەکـرد – باری قـورسی ژیـانی پەنـاهەندەیی و تەنیـایی و دەسکورتی، ئنجـاش نـەبوونـی نـاسنـامـە و وەرنەگـرتنی ئیـقـامـە، ئەوی تووشـی پاشاگەردانییەکی ڕۆحیی زۆر گەورە کردبوو.. ڕەفتار و بیرکردنەوەی ئەوی لە زۆر ڕووەوە گۆڕیبوو.

مـحـەمـەدی حـاجی زادە، ئێـوارەیەک، کـە لە قـاوەخـانەی (پلاس کلیـشی) پێکەوە دانیـشـتبـووین، لای من بۆ یەکـەمین جـار دانی بە واقـیـعـەکـەدا هێنا، گوتی: «ڕاستە».

گوتم: بەڕاست؟

گوتی: ئەی چی بکەم؟

لەتوێی قسـەکانییەوە، محـەمەدی حاجی زادە ڕاشکاوانە گوتی:

– ئەو باوک سووتاوە، بەقەدەر ژنێک شەیدای من بووە.

محەمەدی حاجی زادە ڕاهاتبوو؛ هەمیشە کاتێ ناوی ئەو پیاوە پیرە هۆمۆسێکسوێڵە فەرەنسییەی دەهێنا، بە (ئەو باوک سووتاوە) ناوی دەبرد. درێژەی پێ دا:

– هەر جارێک بچمە لای، سەد و پەنجا فرسەنکیشم دەداتێ.

برسێتی و بێ پارەیی لەم پاریسە بێ ویژدانەدا، کە سەدان لانەواز و بێکاری لەناو مێترۆکانی خۆیدا لەسەرمان و لەبرسان کوشتبوو، هەموو حەوسەڵە و هێزێکی بەرگەگرتنی لە محەمەدی حاجی زادە سەندبووەوە.

محەمەدی حاجی زادە، بێ ئەوەی بتوانێ سەر هەڵبڕێت و تەماشای ناو چاوم بکا، دیسان دووپاتی کردەوە:

– ئەدی چی بکەم؟

سێ ساڵ زیاتر بوو بەبێ هیچ مووچەیەک، بەبێ هیچ دەرامەتێک، ژیانی تەنیایی و کڵۆڵیی خۆی لە پاریس بەسەر دەبرد، دەیگوت کە تەنیا لەپێناو دابینکردنی ژیانی مادی و دارایی خۆی ئەم کارە دەکا. بە تێگەیشتنی خۆیشی (ئەم کارە گوناح نەبوو).

– چونکە لەسەر داخوازی خۆیەتی.. ناشبێتە هۆی چەوساندنەوەی هیچ مەخلووقاتێک. چ قەیدییە!

محەمەدی حاجی زادە وەک ئەوەی لە سەرمان هەڵبلەرزێ، ناولەپی خۆی لەیەکتر دەخشاند.

– ئەدی چی بکەم؟ لەبرسان بمرم؟

بۆ یەکەم جار لەکاتی ئەو گفتوگۆیەماندا تەماشای ناو چاومی کرد، وەک ئەوەی بیەوێ من بە خەتابار بزانێ.

– ئەدی بچم دەست لە خەڵک پان بکەمەوە؟ دەرۆزە بکەم؟!

من لەو دەمەدا یەکسەر هاوڕێیەکی نیگارکێشی خۆمم بیرکەوتەوە کە عەرەبی بەغدا بوو و لە ئۆردوگای پەناهەندەکانی عیراقی لە کەرەج لە مەیدانی

(ذوب اهن) له کەرەج پێکەوە لەناو یەک قاوشدا دەژیاین، ناوی عەلی روبەیعی. شەش مانگ زیاتر بوو یەک دینار تەنانەت یەک فلس لە گیرفانی نەمابوو. ڕۆژێک سەرکز سەرکز، بەڵام زۆر نیگەران هاتە لام گوتی: «فەرهاد!»، گوتم «بەڵێ».

– من ئەگەر ڤیزەی پۆڵۆنیاشم بۆ بگەڕێتەوە بۆ وەزارەتی کیشوەر، ناتوانم سەفەر بکەم.

گوتم: بۆ؟

گوتی: چونکە پارەی بلیتی باڵەفڕەم نییە تا بتوانم لە تاران دەربچمە دەرەوە بەرەو پۆڵۆنیا.

گوتم: ئێ؟

گوتی: تۆ دەزانی یەک دینار تەنانەت یەک فلسیشم لە باخەڵ نییە.

شۆخی لەنێوان من و عەلی روبەیعیدا هەبوو، پێم گوت:

– ئەدی هەفتەی ڕابردوو، هەشتا هەزار تومەنم پێت نەدا، گەواد!

عەلی روبەیعی گوتی:

– ئاغای سالاری داوای لێکردووم بچم وێنەیەکی گەورەی ئیمام خومەینی لەسەر دیوارە گەورەکەی ناو چێشتخانەکە ڕەسم بکەم.

(ئاغای سالاری) بەڕێوەبەری گشتیی ئۆردووگای (پناهندگان عراقی) لە کەرەج، بە ڕەسەن ئەویش هەر – دەیانگوت – عەرەبێکی شیعەی عیراقی، پیاوێکی ڕیشنی دەم و چاو زیپکاوی، لەگەڵ پەناهەندەکان زۆر توند و تیژ؛ ئەو وەختەی گەیشتمە دانمارک، لە کۆپنهاگن هەواڵەکەم بیستەوە: ڕژێمی ئیسلامیی ئێران لەناکاو گرتبووی و ئیعدامی کردبوو چونکە دەرکەوتبوو کە بەدرێژاییی ئەو ماوەیە جاسووسی ڕژێمی عیراق بووە.

عەلی روبەیعی گوتی:

– ئاغای سالاری دەڵێ «ئەگەر ئەم وێنەیەی ئیمام خومەینی لەسەر دیواری

چێشتخانەکە ڕەسم بکەی، سەد ملیۆن تومەنت پێ دەدەم کە بەشی دوو بلیتی باڵەفڕەی چوونە ئەورووپات دەکا.

نەک تەنیا عەلی روبەیعی، ئێمە هەموومان، ئەوەی هەلا هەلابووی ژێر بەرداشەکانی شەڕ، ئێمەی وەچەی ئەو زەمانەی ژێر زوڵمی سەدام و کۆماری ئیسلامیی ئێران، هەموومان باوەڕمان بە مارکسیزم و لەڕوو وەستانەوە دژی ئەو دوو ڕژێمە شەڕخوازە هەبوو کە بەناوی ئیسلامەوە چەندین ملیۆن خەڵکی عیراق و ئێرانیان بەکوشتن دابوو.. بەلامانەوە بێ ڕەوشتی بوو بچین کارێکی لەم جۆرە بکەین.

تۆ بڵێی ئەمە شتێکی ڕەوا بێت هونەرمەندێکی (خاوەن هەڵوێستی) عیراقی، کە لەدەست سەربازی ڕای کردووە و لە ئێران بووەتە پەناهەندە، بچێ وێنەی سەرکردەیەکی شەڕخوازی وەک ئیمام خومەینی لەسەر دیواری چێشتخانەیەکی ئۆردووگا، بۆ شیرینکردنی ئیمام خومەینی لای پەناهەندە عیراقییەکان ڕەسم بکا؟

ئایا ئەمە نابێتە بێ هەڵوێستیی ئەو هونەرمەندە؟ چونکە ئەو هونەرمەندە خۆیشی نەک هەر دژی ئەو شەڕەیە، بەڵکو قوربانیی ئەو شەڕەشە؟

من لەو دەمەدا تەماشای دەموچاوی بێگوناهی عەلی روبەیعیم دەکرد، دەمزانی کە برسێتی و بێ پارەیی شالاوی بۆ بردووە و خەریکە «ئەگەر بە دزیی برادەرەکانیشیەوە بێت» دەچێ پەرەمووچەکەی لەپێناو ڕزگاربوون لەدەست بێ پارەیی و برسێتی دەفرۆشێت. عەلی روبەیعی لێمی پرسی: «بیکەم.. فەرهاد؟».

.. عەلی روبەیعی لە ئاکامدا داخوازییەکەی ئاغای سالاریی بەجێ گەیاند، پاداشتەکەی خۆیشی وەرگرت.

محەمەدی حاجی زادەی مەلای مزگەوتی زەینەبەی تارانم لەو ڕۆژەدا بە هەمان شێوەی عەلی روبەیعی هونەرمەند دەهاتە پێش چاو:

– لەپێناو ڕزگاربوون لەدەست سەمەرگی و بەدبەختی لە غەریبیدا هەموو

شتێک ڕەوایە.. کەواتە؟

من بووم ئەم پرسـیـارەم لە خـۆم کـرد، بێ ئەوەی ئەم بیـرۆکـەیـە (بەقـسـە) بە مـحـەمـەدی حـاجی زادە بڵـێم و مـزایـەدەی ڕەوشـتـیی بە سـەرەوە بکەم، بەتایبـەتیش لەکـاتێکدا من بـۆ خـۆم نەمـدەتوانی (ڕاسـتـیـەکـەی لەدەسـتم نەدەهات) لەوە زیاتر هیچ باربووێکی زیاتری بکەم کە کردبووم.

لەتاو بێ پارەیی و نالەباریی ژیانـی خۆی، محـەمەدی حـاجی زادە پێی وابوو کە «ئەم کـارە گـوناح نـیـیـە، چونکە لەسـەر داخـوازیی پیـاوە هۆمـۆسـێکسـوێلە فەرەنسییەکە خۆیەتی؛ ناشبێتە هۆی چەوساندنەوەی هیچ مەخلووقاتێک».

کەواتە، ئیتر.. بە خـۆمم گوت: «من بە چ هـەقێک ڕێگە بدەمە خـۆم ڕەخنە لە باوەڕ و کردەوەی مرۆڤێک بگرم کە بەڕاسـتیش هیچ گوناحێکی لەهەمبەر هیچ کەسێک نەکردووە؟». کەیفی خۆیەتی.

سـەرەڕای ئەم بێلایەنبـوونەشم، کـاتێ بیـرم لە مەسـەلەکە دەکردەوە، نازانم بۆچی -بەدەست خۆم نەبوو- هـەندێ جار پێکەنینم دەهات. ڕۆژێک لێم پرسـی:

- ئەو پیاوە تەمەنی چەندە؟

گوتی: پیرە. باوک سووتاوە، زۆر پیرە!

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

«ناوی (دونی Denis )ە، بەدرێژاییی ژیانی بـەتەنیـا ژیاوە و هیـچ مـاڵ و منداڵێکیشی نییە.

گوناحە.

زۆر لێم پاڕایەوە! لەکۆتاییدا خۆم پێ ڕانەگیرا. چ بکەم!».

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

«بەئەسـڵ خـەڵکی یەکـێک لە گـوندەکـانی (کلێرمـۆنت فـیـغـۆ)ی باشـووری فەڕەنسایە، کاتی خۆی وێنەی فۆتۆگراف و پوول و کەرەستەی کۆن و توحفەی جـۆراوجـۆری لە گـوندەکـانی باشـووری فـەڕەنسـاوە کڕیوەتەوە و هێناونی بۆ

پاریس؛ فرۆشتوونیەتەوە بە گەلەری و توحفەفرۆشەکانی ناو پاریس.. بەمە ژیاوە و دەوڵەمەند بووە.

ئەو خانووەی ئێستاش تێیدا دەژی، ئاپارتمانێکی گەورەیە، بە میرات لە باوکییەوە بۆی ماوەتەوە، چونکە تەنیا برا و خوشکێکی لەخۆ گەورەتری هەبووە ئەوانیش لەگەڵ باوکی، لە ئاخرو ئۆخری شەڕی دووەمدا لەلایەن نازییەکانەوە کوژراون.

ئێستا بەتاقی تەنیا لەناو ئاپارتمانێکی گەورەدا دەژی.. بێکەسە.

لە دوکانی جلشۆریی ناو گەڕەکەکەماندا، ڕۆژێک دانیشتبووم ڕیزەم گرتبوو بۆ ئەوەی جلوبەرگەکانی خۆم بخەمە ناو ئامێرەکەی جل شتنەوە.. لەوێ ناسیم. لە دوکانی جلشۆریی ناو گەڕەکەکەماندا، لەناکاو هاتە ژوورەوە و دانیشت.. لەوێ یەکترمان ناسی».

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

لە سەرەتادا بە منی گوت «ئەگەر بێیت هەموو ڕۆژێک لە ماڵەوە بمشۆی، هەر جارێک پەنجا فرەنکت دەدەمێ». منیش پێم باش بوو، گوتم «بە هەمووی نیو سەعاتێک ناخایەنێت.. قەدێک لیفکە و سابوونی لە لەشی دەدەم و تەواو. پەنجا فرەنک بۆ ئەو نەختە کارە، هەر زۆر زۆر باشە».

محەمەدی حاجی زادە ڕۆژ تا ئێوارە لە چێشتخانەیەکدا بەردەوام قاپی دەشوشت ئنجا پەنجا فرەنکی وەردەگرت. دەیگێڕایەوە، دەیگوت:

– چووم! چووم بۆ ماڵەکەیان. لە سەرەتادا ئەلبوومێکی دەرهێنا و چەند وێنەیەکی کۆنی کەسوکاری خۆی، یەکە یەکە پیشان دام و هەندێ قسەمان کرد. پاشان چووە ناو حەمامەکەوە و.. منیشی بانگ کرد. کاتێ لەناو حەمامەکەیدا خۆی ڕووت کردەوە، داوای لێم کرد منیش خۆم ڕووت بکەمەوە. منیش، پێم ئاسایی بوو؛ چووم منیش لەناو حەمامەکە خۆم ڕووت کردەوە. ئنجا لیفکەکەی دایە دەستم و گوتی: «هانێ.. پشتم بشۆ!». منیش نەک هەر پشتی بەڵکو هەر هەموو لەشیم جوان جوان شوشت. لەکۆتاییدا ئاوێکی

گەرمی بە لیفکەکە داکرد و لیفکەکەی دایەوە دەستم، گوتی: «گونیشم بشۆ!». منیش، بێ ئەوەی هیچ شەرمی لێ بکەم، لە دڵی خۆمدا گوتم «پیرە، گوناحە؛ چ قەیدییە».. لیفکەکەم لێی وەرگرت و چووم گونیشیم شوشت. لەو کاتەدا، لیفکەکەی لە دەستم سەند و گوتی: «بێنە.. منیش گونی تۆ بشۆم». من لەسەرەتادا وام زانی شۆخیم لەگەڵ دەکا، کەچی وردە وردە دەرپێ قوتەکەی لەبەرم داکەند و پاشان کەوتە سەر لیفکەهێنان بە گەڵ و گونمدا. ئنجا بەنەرمییەوە کەوتە سەر ئەوەی دەست بە گونم دابهێنێت. لەناکاو گوتی: «زەکەرت زۆر گەورە و خۆشە!». پاشان دیتم نەرم نەرم خستیە ناو دەمی خۆیەوە. لەو دەمەدا بوو من یەکسەر تێ گەیشتم کە ئەو پیاوە چیی لە من دەوێ!

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

– کاتێ ویستم تێی بگەیەنم کە من ئەم کارە ناکەم، لێم پاڕایەوە. لەهەمان کاتدا عەینەن ژنێک خۆی نەرم دەکردەوە و نەیدەهێشت بڕۆم. بە دەستی ڕاستی، گونمی گرتبوو؛ دەیگوت «بێنە بۆت بمژم».

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

– لەکۆتاییدا کە خۆم لێی دوورخستەوە، پێمی گوت: «ئەگەر بهێڵیت بۆت بمژم حەفتا و پێنج فرەنکت دەدەمێ». پاشان، هەر لەناو حەمامەکە، کەوتە لاواندنەوەم. بەردەوام سمت و کەفەڵی خۆی لە گونم دەخشاند. کاتێ زیاتریش وورووژا و دیتی منیش زەکەرم خەریکە وردە وردە ڕەپ دەبێ، گوتی: «ئەگەر بهێڵی بۆت بمژم، نەوەد فرەنکت دەدەمێ». گوتم: نا.

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

– هەر دەپاڕایەوە.. ئنجا کاتێ زانی کە من هەر ڕازی نابم، کردی بە (سەد فرەنک). هەر گوتم: نا. پاشانیش کردی بە (سەد و بیست و پێنج فرەنک).. بەردەوامیش سمت و کەفەڵی لە زەکەرم دەخشاند و دەپاڕایەوە.

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

– گوناح بوو، ئیتر. بەزەییم پێیدا هاتەوە.

محەمەدی حاجی زادە پاشان زەردەخەنەیەکی کرد، بە ئاوازێک کە زەبوونی و نائومێدیی لێ دادەچۆڕا، گوتی:

– من.. پەڕاوێزبووێکی ڕۆهەڵاتی..

– ئەویش پەڕاوێزبووێکی فەڕەنسی...

– باش یەکتریمان دۆزیوەتەوە. ها؟

ئنجا لە کۆتایی قسەکانیدا هەناسەیەکی ڕووزەرد و کۆستکەوتووانەی هەڵکێشا:

– ئەوروپاییەکان کاتێ تێک دەشکێن و بەم شێوەیە بەدبەخت دەبن.. ئنجا دادەبەزنە خوارەوە بۆ ئاستی ئێمەی پەناهەندە... ئاغای فەرهاد!

گوتم: واتە چۆن؟!

– ئەوروپاییەکان کاتێ تێک دەشکێن، ئنجا بۆ ئاستی ئێمەی پەناهەندە دادەبەزنە خوارەوە.

وەک ئەوەی تەڵزمێک شرۆڤە بکا تەماشای خاڵێکی دەکرد:

– چونکە ئەوروپاییەکان، تێبینیم کردووە: خۆیان زۆر بڵندتر و ناسنامەی خۆیان زۆر شکۆمەندتر، ئێمەش زۆر پاین و بچووک تەماشا دەکەن.

من وەڵامیم نەدایەوە، بەڵام لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەم کارەی تۆ جۆرێکە لە تۆڵەسەندنەوە».

کە ئەم قسەیەم کرد، زەردەخەنەیەکیش کەوتە سەر لێوم.

محەمەدی حاجی زادە، بێگومان تێ نەگەیشت مانای ئەو زەردەخەنەیەم چی بوو. بەڵام ئەگەر لێمی پرسیبا بۆچی ئەو زەردەخەنەیەم بۆی کرد، ئەوا ڕاست و دروست پێم دەگوت:

– فەرەنسا چونکە ئیقامە و مافی پەناهەندەیی نەداوە بە تۆ، تۆش لە ڕقی ئەمە دەچیت تۆڵەی خۆت لە پیرەمێردەکانیان دەکەیتەوە.

باوەڕناکەم ئەگەر ئاوهام پێ گوتبا، تووڕە بووایە.

من ئەم قسەیەم بە محەمەدی حاجی زادە نەگوت. بەڵام ئەم لەناکاو، کە من هەرگیز چاوەڕێم نەدەکرد – بە ئاوازێکی پڕ لە ڕقەوە، کە من یەکەم جار بوو ئەوەم تێیدا بەدی کرد، گوتی:

– ئایەتوڵڵا و عەمامە بەسەرەکانی ئێران بە سیاسەت و چەک شەڕ لە دژی ڕۆژئاوا دەکەن.. منیش بە زەکەرم.

دووای ئەم قسەیە، دەستی کردە پێکەنین.

منیش پێ کەنیم.

دووای ڕابووردنی چەند مانگێک، لە مۆنتماخت، من پێکێک شەرابی مارتینی و محەمەدی حاجی زادەش بۆ یەکەم جار دیتم داوای بیرەیەکی توویۆرگی کرد.

بیرەی توبۆرگ!

پێم خۆش بوو کە دەستی کردووەتە بیرەخواردنەوە. بە تانووتەوە پێم گوت: «بۆ نەخۆشیی کلیە باشە».

دووای هەندێک قسەی خۆش و حەنەک، محەمەدی حاجی زادە گوتی: «فەرهاد!». گوتم: «چییە؟».

– ئەو باوک سووتاوە پێم دەڵێ «ئەگەر بێیت لە ماڵەکەی مندا بەشێوەیەکی بەردەوام لەگەڵم بژیت و بەردەوام لە ماڵەوە ئاگات لێم بێ، بەڵێنت دەدەمێ ئاپارتمانەکەی خۆمت لەسەر تاپۆ دەکەم».

بە سەرسوڕمانەوە گوتم: چی؟!

بۆ دڵنیابوونم دووپاتی کردەوە:

– پێم دەڵێ «ئەگەر بێیتە لام و بەردەوام لەگەڵم بژیت؛ دەچین بۆ لای پارێزەر و ئاپارتمانەکەی خۆم دەخەمە سەر ناوت».

من لەو کاتەدا دەمودەست دەرکم بە قووڵاییی برینی «تەنیایی»ی ئەو پیاوە

هۆمۆسێکسیۆوێڵە فەرەنسییە کرد! تەنیایی مرۆڤی ئەورووپاییی لەو تەمەنە پاییزییە ناهەموارەدا چەنێک کوشندە و چەنێک جێگەی بەزەییە! ئەو پیاوە پیرە، دیارە، پیاوێکی چەنێک بێکەس و پەراوێزخراوە.

گوتم: بەڕاستتە؟

گوتی: جیدی.

من هیچم نەگوت، نەمگوت بیکە.. نەشمگوت مەیکە! بەڵام محەمەدی حاجی زادە دیار بوو ئەو ماوەیە بەتەواوەتی بووژابووەوە.

بەم شێوەیە.. چەندین مانگ ئاوها لەگەڵ ئەو هۆمۆسێکسوێڵە پیرە فەرەنسییە، محەمەدی حاجی زادە بۆ خۆیان بەردەوام، پێکەوە دەژیان. ئەرشەدی قازی دەیگوت «دەچنە سینەماش پێکەوە».

- دووای تەواوبوونان هەموو جارێک سەد و پەنجا فرەنکیشم دەداتێ. خراپی چییە؟

لەو ماوەیەدا، محەمەدی حاجی زادە جگە لەوەی تێر و پۆشتە و کۆک، کەمێک حەسابووەوەش، چونکە نەدەچوو شەو تا بەیانی لە چێشتخانەکاندا قاپشۆری بکات و بەقەدەر جاران ماندوو ببێت.

لەو ماوەیەدا محەمەدی حاجی زادە هەمیشە تێر و پۆشتە و کۆک، جار جار دەهاتە مۆنتماخت، وەکو جاران هەندێ قسەمان دەکرد و بیرەیەکمان پێکەوە دەخواردەوە و دەڕۆیشت. دوواتر وردە وردە فێری خواردنەوەی (وێسکی) و (ڕاکی) و (پۆرتۆ)ش بووبوو. ئەرشەدی قازیی برادەرە مهابادییەکەشم، کە لەوانەیە سەبارەت بە کۆمۆنیستبوونی خۆی زۆر ڕقی لە مەلا بوو، جارجار هەواڵێکی تازەی لەبارەیەوە بۆمان دەهێنا؛ جارێکیان گوتی:

- ئێستا لە هەر هەموو تاران بڵاوبووەتەوە: مەلا محەمەدی تارانی، کە جاران لە حەوزەی عیلمیی تاراندا پلە و پایەیەکی باڵای هەبوو؛ کەچی ئەمڕۆ بووەتە هۆمۆسێکسوێڵ و لە پاریس لەگەڵ هۆمۆسێکسوێڵێکی پیری فەرەنسی پێکەوە دەژین.

بە گاڵتەپێکردنەوە، ئەرشەدی قازی بەردەوام ئەم قسانەی دەکرد.

ڕۆژێک بیرم لە محەمەدی حاجی زادە دەکردەوە، لە دڵی خۆمدا گوتم: تۆ تەماشاکە، مەلایەکی ئۆپۆزیسیۆن، پیاوێک کە هێندەش شانازیی بە ئێرانیبوونی خۆیەوە دەکرد و هێندەش نەریتی ئیسلام و ڕۆهەڵاتیانەی لەلا بەرز و پیرۆز بوو، ڕژێمی کۆماری ئیسلامیی ئێران، چۆن توانیویەتی ئاوها وردە وردە ئاوارەی بکات و وێڵ و سەرچیغ بەناو ژیانی توورەهاتی پاریسدا وەندا و سەرگەردانی بکات لەپێناو لوقمە نانێکدا!

لەو کاتەدا بوو من تێ گەیشتم کە کۆماری ئیسلامیی ئێران بۆچی، دووای تەواوکردنی خزمەتی سەربازی، ڕێگە دەداتە هەر کەسێک ئەگەر بیەوێت ئێران بۆ تا هەتایە جێ بهێڵێت و سەرهەڵبگرێ بەرەو دەرەوەی وڵات!

ڕاکردن لەدەست زوڵم و لەسێدارەدان و بەندیخانە و دکتاتۆریەتی دەوڵەت، تەنانەت بۆ ئەو کەسانەش کە دیندار و مەلا و پابەندی نەریتەکانن.. چ سەفەرێکی سەخت و پڕ ئازارە؟

ئەم ڕاکردنە لەدەست زوڵم و ئیعدامی ناو وڵات چۆن دەتوانێ، تەنانەت سەرتاپای ئیمان و بۆچوون و ڕەوشت و باوەڕەکانیشت سەرەوژێر بکاتەوە!

چەند مانگێک دوواتر، شەوێک، لەناکاو، محەمەدی حاجی زادە تەلەفۆنێکی بۆ کردم بۆ هوتێلەکەم، مۆسیقایەکی غەمگین لە دەنگییەوە دەهات:

– فەرهاد... !

گوتم: بەڵێ.

محەمەدی حاجی زادە نەیدەتوانی قسە بکا. هەستم کرد دەگری:

– (دونی ) مرد.

گوتم: کێ مرد؟

گوتی: دونی.

نەیگوت: «ئەو باوک سووتاوە»، بەدەم گریانەوە گوتی: «پیاوە پیرەکەی هاوڕێم».

نەگبەت و بەدبەخت محەمەدی حاجی زادە!

ژیانی تەنیایی و کلۆڵی و کوللەمەرگیی محەمەدی حاجی زادە.. لە پاریس.. دیسان دەستی پێ کردەوە!

پێش ئەوەی تەلەفۆنەکە دابخەینەوە، لێم پرسی:

– خانووەکەی، بە ناوتەوە تاپۆ کردبوو؟

بە دەنگێکی غەمگین و تووڕەوە گوتی:

– خۆ من نەچووبووم بەردەوام لە ماڵەوە لەگەڵی بژیم. نا.

لەو ڕۆژەوە ئیتر محەمەدی حاجی زادە، دیسان، کەوتەوە سەر گەڕان بەدووای کار و جارجار قاپشۆری لەناو ڕێستورانتە پیسەکانی پاریسدا.

## من تەنیا یەک فەڕەنسی دەناسم
## داوای لێ بکەم کارێکت بۆ بدۆزێتەوە

ئەو گەنجە لبنانی و فەلەستینیانەی لەسەرەتای تازە گەیشتنم بۆ پاریس لە کەمپەکەدا لەگەڵم بوون، سەبارەت بەوەی ئەوانیش وەک من مافی نیشتەجێبوونیان هێشتا بۆ دەرنەچووبوو؛ دەچوون پارچەزێڕی بچووک و قەمسەڵە و پانتۆڵیان لە مغازە و سووپەرمارکێتەکانی پاریسدا دەدزی و لە بازاڕی ڕەش یان لەبەردەم بازاڕی (تاتی) لە (مارکادی پواسۆنییێغ) بەهەرزانتر دەیانفرۆشتەوە. تەنانەت ڕۆژنامەنووسێکی بەحرێنیی برادەریشم، کە ناوی سافی ئەیریس بوو، ئەویش هەر لە کۆتاییدا دەستی کردە دزیکردنی ناو مغازەکان. دوو برادەری عەرەبی عیراقیشم لەگەڵ بوون، هەردووکیان لە خەفەتی ئەوەی چوار ساڵ بوو هێشتا ئیقامەیان بۆ دەرنەچووبوو؛ خۆیان کوشت، یەکێکیان خۆی فڕێ دایە ژێر شەمەندەفەری ناو مێترۆی (کلییان کوورت) و هەلا هەلا بوو، ئەوی تریش لە قاتی یازدەمی ساختمانێکی مۆنتپەرناسەوە خۆی تووڕ هەڵدایە خوارەوە و گیانی سپارد. گورجستانییەکمان لەگەڵ بوو، ئەو لە داخان بەرگەی ئەم هەموو ساڵ چاوەڕوانییەی نەکرد؛ شێت بوو و بردیانەوە تفلیس. پەنابەرە نیپاڵی و ئەفغانییەکانیش هە زۆر زوو تێ گەیشتن کە وەرگرتنی مافی پەناهەندەیی لە فەرەنسا زەحمەتە، بۆیە ئەوانیش هەر زوو پاریسیان بەجێ هێشت و سەری خۆیان هەڵگرت بەرەو (لەندەن). وەڵحاسڵ، لەناو برادەرە پەناهەندەکانی ئەو کەمپەم تەنیا منم ماومەتەوە. تەنیا منم ئەوا بۆ چوار ساڵ دەچێ بەرگەی ئەو هەموو ناهەمواریيەی پەناهەندەییم گرتووە بەبێ مافی ئیقامە، بەبێ پەساپۆرت، بەبێ کار. چی بکەم؟! خەریکە شێت دەبم. ناتوانم هیچ بکەم. من

هیچ ناسنامەیەکم نییە.

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

«من تازە تێ دەگەم کە مانەوەی پەناهەندەیەک بەبێ مۆڵەتی پۆلیس لە پاریس چەندێک سەختە! من دووایین پەناهەندەم لەناو برادەرەکانی کەمپەکەی خۆمدا، وا بۆ چوار ساڵ دەچێ.. بەبێ ئیقامەم، بێ ماڵ و حاڵ!».

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

«ئەورووپا تەنیا بۆ ئەو کەسانە خۆشە کە پارەیان هەیە، تەنیا بۆ ئەو کەسانەی کە بۆ ماوەی تەنیا چەند هەفتەیەک بۆ گەشتەوەری دێنە ئێرە و پاشان دەگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان.

وەک سەگ لەناو ئەو چێشتخانە پیسانەی کاریان تێدا دەکەم، مردم هێندەی پاشماوەکانی ناو مەتبەخ بلێسمەوە. من لە وڵاتی خۆمدا هیچ نەبووایە ماڵێکم هەبوو، حاڵێکم هەبوو، ناوبانگێکم هەبوو.. لێرە ئەسڵەن هیچ ناسنامەیەکیشم نییە. من لێرە کێم؟! چیم؟!

سێ جەمە شیر و ئارد و هێلکە لەناو تاوەیەک دەگرمەوە و دەیکەم بە نانەهێلکە و دەیخۆم.. ئاوها دەژیم. چ بکەم؟

لەناو ژوورێکی یازدە مەتر چوارگۆشەدا، دەسشۆرێک و سیسەمێک و دووشێک و تەباخێک.. توالێتەکەشم هاوبەش لەگەڵ پەناهەندەیەکی سریلانکیی ناو ژوورێکی تری دەرەوەی ئاپارتمانەکەم.

ئەمەیە ژیانی من تا هەتایە لە پاریس!».

من بەداخەوە بووم بۆ محەمەدی حاجی زادە، زۆرم پێ ناخۆش بوو کە دەمدیت محەمەدی حاجی زادە، جاران مەلا؛ کە هێندەش بە ئەسڵ و فەسڵی ئێرانیبوونی خۆی و بە ڕەسەنایەتیی کولتووری ئیسلام و ڕۆهەڵاتەوەی دەنازی و دەیویست لە ئێران دین لە دەوڵەت جودا ببێتەوە و کۆماری ئیسلامیی ئێران بەڕاستی ببێتە کۆماری ئیسلامیی ئێران.. لە پاریس ئەمڕۆ

ئاوها ڕەزیل و سـەفـیل.. هیچ کـەسێک لە من زیاتری نەبوو ئاوڕێک لە ژیانی بداتەوە!

دەمویست بە یادی جاران دیسان لێی بپرسم:

– ئاخۆ ئەمە خەتای کۆماری ئیسلامیی ئێرانە یان خەتای فرانسوا میتران کە تۆ ئاوها کڵۆڵ و بەدبەخت لە پاریس کەوتووی؟

بەڵام دڵم نەدەهات، چونکە بەڕاستی زۆر تەقدیری ئەو پیاوەم دەگرت و زۆرم پێ ناخۆش بوو هەموو جارێک دەمدیت بەم شێوەیە دەکڕووزایەوە. ڕۆژێک گەیشتە تینم پێم گوت:

– من تەنیا یەک فەرەنسی دەناسم داوای لێ بکەم کارێکت بۆ بدۆزێتەوە.

– کێ؟ ئەدی بۆ پێی ناڵێی؟

گوتم: مسیۆ لووسیانا.. خاوەن هوتێلەکەم.

گوتی: ئەو پیاوە جوولەکەیەی دەڵێی بە من دەچێ؟

– بەڵێ.

وەک ئەوەی بەزەییی بە حاڵی خۆیدا بێتەوە و لە دڵی خۆیدا بڵێ «گەیشتینە ئەو ڕادەیەی داوا لە جوولەکەیەک بکەین ڕزگارمان بکا؟!»، پرسیی:

– گوتت «بەئەسڵ جوولەکەی پورتوگاڵە»؟

– بەڵێ.

محەمەدی حاجی زادە جەختی کردەوە:

– واتە جوولەکەیە؟

– بەڵێ.

وەک ئەوەی بەلایەوە ڕیسوایی بێت، گوتی:

– واتە بە جوولەکەیەک بڵێم کارم بۆ بدۆزێتەوە؟

من لەو دەمەدا بیرۆکەیەک هات بە خەیاڵمدا و ویستم پێی بڵێم: «ڕۆژهەڵات

هەمیشە پێویستی بە ئەورووپا هەبووە. چ قەیدییە». گوتم:

– ئێستا؛ پێی بڵێم یان نا؟

محەمەدی حاجی زادە کاتێ هەستی کرد بەجیدیمە، ئەمجارە بەگومانەوە تەماشای پرسیارەکەی منی کرد، گوتی: «ئەو.. من دەناسێ؟».

– نەخێر، تەنیا ئەوەندەم پێ گوتووە ئێوە هەردووکتان زۆر لەیەکتر دەچن.

وەک ئەوەی ئەمە یەکەمجاری بێت گوێی لەم قسەیەی من بووبێت، گوتی:

– ئەوە تۆ بەڕاستتە کە من و ئەو هێندە لەیەکتر دەچین؟

گوتم: هەر دەڵێی سێوێکن و کراون بە دوو لەتەوە.

– جیدی؟

– هەر زۆر زۆر بەیەکتر دەچن.

محەمەدی حاجی زادە لێمی پرسی:

– پێت گوتووە کە من کاتی خۆی مەلا بوومە؟

گوتم: بەڵێ.

– دەشزانێ کە من ئێرانیم.

گوتم: بەڵێ.

– تۆ جارێکیان پێت گوتم کە زمانی فارسیش دەزانێت و ئەدەبی فارسی دەخوێنێ.

گوتم: بەڵێ، دوکتۆرانامەکەی لەسەر ئەدەبی فارسییە.

محەمەدی حاجی زادە بیرێکی کردەوە و گوتی:

– ئنجا جوولەکەیەک ئەگەر بزانێ کە من کاتی خۆی مەلاش بوومە؛ چۆن؟

من دەمویست قسەیەک بکەم، محەمەدی حاجی زادە لچێکی هەڵقورتاند و بە غەمگینی و خەمساردییەوە گوتی:

– باوەڕ ناکەم جوولەکەیەک، خاوەن هوتێلێکی لوکس لە پاریس، کار بۆ

مەلایەکی ئێرانیی (پەناهەندە) بدۆزێتەوە.

لە کۆتاییدا گوتی:

– پێی مەڵێ!

من خەریک بووم، پێی بڵێم: «نا. مسیۆ لووسیانا لەو جۆرانە نییە»، محەمەدی حاجی زادە سەری نەخێری ڕاوەشاند:

– پێی مەڵێ!

## پیاوێکی عەرەبی مەغریبی

## بە ناوی موبارەک

محەمەدی حاجی زادە، بەدرێژاییی ئەو ماوەیەی بێکاریی خۆی تا ئەو کاتەی ڕێستورانتێکی دیکەی دەدۆزییەوە بۆیٔ دوەی قاپشۆریی تێدا بکا؛ فێر بووبوو دەچووە ناو دالآنە پانوپۆڕە گەورەکەی بەردەم کلێساى نۆتردام یان لەناو باغی لووکزەمبوورگ (زۆر جاریش دەچووە ناو قاوەخانەکانی ژووسیۆ و سۆربۆن کە خوێندکارە گەنجەکانی زانکۆیان لێ بوو)؛ خۆی سەرقاڵی دەست خوێندنەوە و فاڵگرتنەوە دەکرد، کە لەوێ هەندێ پیر و پیرەژن و پیرەمێردە فەرەنسییەکان یان تووریستەکان، بەتایبەتیش خوێندکارەکانی زانکۆ، زۆریان پێ خۆش بوو. بەرامبەر بەمەش، خەڵک لانی کەم فرەنکێکیان دەدایە.

لە مۆنتماخت، کاتێ برادەرە نیگارکێشەکانم ئەم هەواڵەیان بیستەوە؛ ئەرشەدی قازی، یەکەمین کەسێک بوو کەوتەوە گاڵتە پێکردنی؛ هەموو جار دەیگوت:

– برادەرەکەرەی فەرهاد بووە بە فاڵچی.

ڕووباری (سێن)ت بەجێ دەهێشت بەرەو شەقامی (شاروون) تا دەگەیشتیتە گەڕەکی (سانت ئەنتوان)، لە نزیک کەنیسەی (مادلێن دو ترۆنێل) لە شەقامی (سانت ئەنتوان) ڕێستورانتێکی خنجیلەی کوردەکانی تورکیا هەبوو بە ناوی (دیلان)، خاوەنەکەی کورد بوو، ناوی (سەیدۆ)، برادەرم بوو؛ چەند مانگ جارێک یەکێک لەو تابلۆیانەی منی دەفرۆشت کە بە دیواری ڕێستورانتەکەیەوە هەڵم دەواسین.

سەیدۆی خاوەن ڕێستورانتی دیلان ئێوارەیەک ڕازی بوو کە ئەم محەمەدی

حاجی زادە ئێرانییە شەوان بێتە ڕێستورانتەکەی و فاڵ بۆ میوانەکان بگرێتەوە (بەڵام بە مەرجێک تەنیا لەکاتی پشوودانی نێوان ئاهەنگەکاندا، کە تیپێکی مۆسیقای کوردیی خەڵکی عفرین پێشکەشیان دەکرد).

قاوەگرتنەوە و دەست خوێندنەوەی محەمەدی حاجی زادە بۆ میوانەکانی ڕێستورانتی (دیلان) هەر بۆ خۆشترکردنی ئەتمۆسفێری ڕێستورانتەکە خۆیشی باش بوو؛ لە بەرژەوەندیی (سەیدۆ)دا بوو. چونکە، وەک پاشانیش بۆ سەیدۆ وەدیارکەوت؛ میوانی وا هەبوو تەنیا لەبەر خاتری فاڵگرتنەوەکانی محەمەدی حاجی زادە دەهاتە ئەوێ.

زۆر لە میوانەکانی ڕێستورانتی دیلان (بەگوێی خۆم چەندین جار گوێم لێیان بووبوو) لەبارەی فاڵ و دەستخوێندنەوەکانی، دەیانگوت:

– ئەو قسانەی حاجی زادە دەیڵێ، دەقاودەق ژیانی منە.

محەمەدی حاجی زادە بە مەبەستی خۆشترکردنی مەجلیسەکە و بە پێکەنین هێنانی میوانەکان، هەندێ جار – بەتایبەتیش دووای ئەوەی چاوی کرایەوە و زانی کە خەڵکەکە خۆشیان دەوێ – نوکتەی جۆراوجۆریشی لەبارەی سەرکردە و عەممامە بەسەرەکانی کۆماری ئیسلامیی ئێران بۆ خەڵکە فەرەنسییەکە دەگێڕایەوە بۆ ئەوەی پێ بکەنن و پارەی بدەنێ. شەوێک منیش لەوێ بووم، گێڕایەوە گوتی:

– جارێکیان وەزیری ڕۆشنبیریی کۆماری ئیسلامیی ئێران لەلایەن وەزیری ڕۆشنبیریی فەرەنساوە دەعوەت دەکرێتە پاریس. وەزیری ڕۆشنبیریی فەرەنسا، وەزیرە ئێرانییەکە دەباتە مۆزەخانەی لووڤەر. لەناو مۆزەخانەکەدا، لە بەشی توحفە نایابەکانی پاشا فەرەنسییەکاندا، یەکە یەکەی کەرەستەکانی ناوماڵی لویسی چواردەم پیشانی وەزیری ڕۆشنبیریی ئێران دەدا. وەزیری ئێران لەناو کەلوپەلەکانی ناو دیوەخانەکەی لویسی چواردەمدا چاوی بە جووتە پێڵاوێکی لویسی چواردەم دەکەوێ و سەرنجی ڕادەکێشێ، بە وەزیری فەرەنسی دەڵێ «ئەم جووتە پێڵاوەی لویسی چواردەم زۆر جوانە». وەزیری

فەڕەنسیش، وەک ڕێزلێنانێک، فەرمان دەدا کە جووتە پێڵاوەکەی لویسی چواردەم بەدیاری پێشکەش بە هاوپایە ئێرانییەکەی بکەن. وەزیری ڕۆشنبیری ئێران هەر لەوێ تاکە پێڵاوێکی لویسی چواردەم بە مەبەستی تاقیکردنەوە لە پێ دەکات، دەبینێ بۆ قاچی ئەو کەمێک تەنگە.. بە وەزیری ڕۆشنبیریی فەڕەنسا دەڵێ: «ئەم جووتە پێڵاوەی لویسی چواردەم بۆ قاچی من کەمێک تەنگە، جووتە پێڵاوێکی لویسی شازدەهەمتان نییە، بمدەنێ؟!».

دووای گێڕانەوەی ئەم جۆرە نوکتانە، زۆربەی جارانیش دووای هەر فاڵگرتنەوەیەک، میوانەکان بێگومان پارەیەکی زیاتریان دەدایە.

لە هەمووی سەرنجڕاکێشتر ئەوە بوو کە محەمەدی حاجی زادە، هەندێ جار پێش ئەوەی دەستی ئەو کەسە یان چەهرەی ئەو کەسە بخوێنێتەوە.. پێشبینییەکی لەناکاوی خۆی لەبارەی ئەو کەسەوە دەردەبڕی.. زۆر جارانیش ئەو پێشبینییە ڕاست دەردەچوو. بۆ نموونە جارێک پیاوێکی عەرەبی سووریا، ناوی (عەوواد)، کە بیستبوویەوە مەلایەکی ئێرانی لە ڕێستورانتی دیلان فاڵ دەگرێتەوە و کون بە کون بەدووایدا گەڕابوو تا دۆزیبوویەوە.. هاتبووە لای محەمەدی حاجی زادە. محەمەدی حاجی زادەش پێش ئەوەی لەگەڵ ئەو پیاوە عەرەبە سوورییە دابنیشێت، هەر لە دوورەوە، کاتێ بینیبووی، پێی گوتبوو: «تۆ.. دەتەوێ بزانیت ئایا ژنەکەت خیانەتی لێت کردووە یان نا». پیاوە عەرەبە سوورییەکە بەم پێشبینییە لەناکاوەی محەمەدی حاجی زادە زۆر سەرسام بووبوو، کەچی پێی گوتبوو «نەخێر وا نییە، من بۆ شتی تر هاتوومە لات». ئنجا کاتێ محەمەدی حاجی زادە دەستی کردبووە خوێندنەوەی چەهرەی کابرا و پاشانیش لەکاتی قاوە خوێندنەوەکەیدا دەرکەوتبوو کە کابرای عەرەب (دانی پێدا نابوو) بۆ هەمان مەبەست هاتبووە لای و.. دوواتریش محەمەدی حاجی زادە پێی گوتبوو کە بەڕاستیش ژنەکەی خیانەتی لێ کردووە و پێویستە بەزووترین کات تەڵاقی بدا.. ئەم قسەیە لەناو هەموو ڕێستورانتەکەدا دەنگی دایەوە و بووە دەنگۆ.. بەتایبەتیش چونکە لە ئاکامدا کابرای عەرەبی سووری، ژنەکەی خۆی تەڵاق دا، لەبەرئەوەی بەڕاستی (خۆی بۆ سەیدۆی

خـاوەن ڕێسـتـورانتی دیلان باسـی کـردبوو) ژنـەکەی، دانی پێـدا نابوو کـە بۆ ماوەی سـاڵێک بوو پێوەندیی لەگەڵ پیـاوێکی ئێرلەندی پەیداکردبوو، کە پاشـان مێردیشـی پێ کرد.

مـحـەمـەدی حـاجی زادە هـەرگـیز بیـری لـەمـە نەکـردبووەوە کە مـیـوانەکانی ڕێسـتـورانتـی دیلان تـا ئەو ڕادە زۆرە حـەزیان لـە ناولـەپ خـوێندنـەوە و فـاڵگرتنەوەیە! لەوانەشـە ئەم بێبـاکـییـە هـی ئەوە بووبێ کـە ئەو خـۆی حـەزی نەدەکرد درێژە بەم کارە بدات و لێی ببێتـە پیشـەیەک، بەڵکو.. تەنیـا ئەوەندەی دەگوت:

– هیچ نەبێ ئێواران ژەمێکی تێر لای سەیدۆ دەخۆم.

لە کـۆتاییـدا سـەیدۆی سـاخـبـێـری ڕێسـتـورانتی دیلان بـڕیاری دا کـە بۆ یەکجاری لە ڕێستورانتەکەی خۆی بیهێڵێتەوە.

ئیـتـر بـەم شـێوەیـە، مـاوەیەکی زۆری دیکەش لە پـاریس، مـحـەمـەدی حـاجی زادە، بە فـاڵگرتنەوە و چەهرە خـوێندنـەوە و قـاوە گرتنەوەی نـاو ڕێسـتـورانتی (دیلان) ژیانی خۆی بەڕێوە برد.

هـاتنـی لەناکـاوی سـاقی گـوڵچین لـە سـان فـرانسـیـسکۆوە بۆ سـەردانی مـورتەزای برای لە پاریـس، دوو سـوودی (بۆ من و بۆ مـحـەمـەدی حـاجی زادە) هەبوو.. یـەکـەم: هـەر لـە یەکـەم ڕۆژی گـەیشـتـنی سـاقی گـوڵچین بـۆ پاریس، مـورتەزای برای سـاقی گوڵچین، لەڕێگەی مـحەمـەدی حـاجی زادەوە پێوەندیی بە منەوە کـرد بۆئەوەی تـابلۆ ئۆرژینالـەکانی خـۆم پیـشـانی ئەو خـانمە بدەم، لەپێناو ئەوەی هـاوکارییەک لەنێوان من و ئەودا دروست ببێت. ئەوە بوو کە ئەم یەکتـرناسـینـەمـان بووە هۆی ئەوەی کـە من هـەمـوو سـاڵێک بـڕێک پارەی باشـم لەڕێگەی فرۆشتنی تابلۆکانمەوە لە سان فرانسیسکۆوە دەست بکەوێت.

دووەم شـتـیش ئەوە بوو کـە سـاقی گـوڵچین کـارێکی بـاشـی بۆ مـحـەمـەدی حاجی زادە لە شـاری (گرۆنۆبڵ) لە باشووری پاریس دۆزییەوە. ئەمـە وای کرد مـحـەمـەدی حـاجـی زادە بۆ مـاوەی چەند مـانگێک، دیسـان بۆ خـۆی نەخـتێک

بحەسێتەوە. ساقی گوڵچین دوواتر بەپێکەنینەوە بە منی گوت:

– من بمزانیـــــــایە، هەر زۆر زووتر دەهاتم بۆ پاریس، بۆ ئەوەی ئەم بەدبەختەی برادەرتان ئاوها (بێکار) نەمێنێتەوە.

ساقی گوڵچین، قژکورتێکی چاو و برۆ ئێرانی، هەمیشە کۆک و ڕێکپۆش، لەو ژنە سەڵتەنەتخوازانە بوو کە باوەڕی وابوو پێویستە بنەماڵەی ڕەزاشا بگەڕێنەوە سەر حوکمی ئەمڕۆی ئێران؛ خاوەن گەلەرییەکی ناودار لە سان فرانسیسکۆ، لەهەمان کاتدا فێمینیستێکی لیبراڵیش بوو، لە ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتیی فێمینیستانەی ژنانی ئێران لە ئەمەریکا کاری لەپێناو ماف و داخوازی و ئازادییەکانی ژنانی ئێران دەکرد؛ بۆیە ئافرەتانی قەیرە و سۆزانی و فێمینیست و سەیر و سەمەرە و خاوەن گرفتی جۆراوجۆری لە هەر چوار قوڕنەی دنیاوە دەناسی، دەیگوت:

– ژنێکی ئێرانی دەناسم، دەستەخوشکی دێرینمە، لە شاری گرۆنۆبڵ لە باشووری پاریس دەژی، لە سەڵتەنەتخوازەکانی سەر بە حیزبی ڕەزاشای جارانی ئێرانە و ناوی (ڕوئیا)یە. ئەم ژنە، کە لەڕاستیدا بێوەژنێکە.. ژنی پیاوێکی دەوڵەمەند، جەنەڕاڵ بوو لە جەیشی ڕەزاشا؛ هەر لەو وەختەوەی لە ئێرانیش بوون منداڵیان نەدەبوو. دووای ڕووخانی ڕەزاشا هەردووکیان پێکەوە شاری مەشهەدیان جێ هێشتبوو و هاتبوونە پاریس. بەڵام ئێستا، دووای مردنی مێردەکەی، هەرچی سەروەت و سامانی مێردەکەی هەیە بۆ ئەو ماوەتەوە، حەزیش ناکا بگەڕێتەوە ئێران.. بەتاقی تەنیا لە گرۆنۆبڵ دەژی.. خۆی و سەگێکی بچکۆڵەی.. بەتاقی تەنیا لەناو تەلارێکدا دەژین.

ساقی گوڵچین دەیگوت:

– ئەم ژنەی دەستەخوشکم، ڕوئیا خانم، ئێستا تەمەنی، نزیکەی پەنجا ساڵێک دەبێ؛ پیاوێکی عەرەبی مەغریبی، شێت و شەیدای بووە و داوای لێ دەکا مێردی پێ بکا. کەچی ڕوئیا خانم تاکو ئێستا مێردی پێ نەکردووە و دوودڵە لە بڕیاردان، چونکە ڕوئیا خانم لەناو خۆیدا بیر لەوە دەکاتەوە کە

کابرای مەغریبی لەپێناو موڵک و میراتەکەی مرخی لێی خۆش کردووە نەک لەبەر خاتری ئەوەی کە خۆشی بوێت!

ساقی گوڵچین دەیگوت:

– ڕوئیا خانم دەڵێ «ئەم پیاوە شێتی کردووم و وازم لێ ناهێنێ؛ منیش نازانم ئاخۆ ئەم پیاوە بەڕاستی منی خۆش دەوێ یان تەنیا لەپێناو موڵک و سامانەکەمە وازم لێ ناهێنێ».

ساقی گوڵچین دەیگوت:

«من خۆیشم جارێکیان ئەم پیاوە عەرەبەم بینی (هەر تەنیا ئەو جارەش بینیم و تەواو). ڕوئیا خانم دەڵێ کۆمپانیایەکی بەرهەمهێنانی فیلمی سینەمایی هەیە لە گرۆنۆبڵ.

پیاوێکی زۆر ڕەزا گران و بێ شەخسیەت بوو. ئەسڵەن منیش حەزناکەم کە ڕوئیا خانمێکی هێندە نازدار و نەجیبزادە مێرد بە پیاوێکی عەرەبی مەغریبیی ئاوها هێسک قورس و ناچیزە بکا.

وابزانم ناوی پیاوەکە (موبارەک) بوو.. پیاوێکی ئەسمەری ورگن، خاڵێکی گۆشتن (کە زیاتر لە زیادەگۆشتێک دەچوو وەک لە خاڵ) لەسەر ڕوومەتی چەپی هەبوو».

ساقی گوڵچین دەیگوت:

– ڕوئیا خانم کە لە ئێرانیش بوو زۆر باوەڕی بە نوشتە و متفەڕک و سیحر و چەهرە خوێندنەوە و ئەم جۆرە شتانە هەبوو. بە زمانی خۆی پێی گوتووم: «ئەگەر (ممنوع الورود)ی ئێرانم لەسەر نەبووایە، دەگەڕامەوە بۆ ئێران و دەچووم لای یەکێک لە فاڵگرەوە تارانییەکان بەختی خۆمم دەگرتەوە، ئاخۆ بمزانیایە ئایا موبارەک بەڕاستی خۆشی دەوێم یان تەنیا لەبەر موڵک و میراتەکەمە کە ئاوها گەڕی تێ ئاڵاندووم».

ساقی گوڵچین دەیگوت:

– ڕوئیا خانم ئێستا شاگەشکە دەبێ ئەگەر مەلایەکی تارانیی وەک محەمەدی حاجی زادە بناسێ کە ناولەپ دەخوێنێتەوە و فاڵ دەگرێتەوە.

ساقی گوڵچین پێش ئەوەی پاریس جێ بهێڵێ بە دوو ڕۆژ، تەلەفۆنی بۆ ڕوئیا خانم کردبوو، هەموو شتێکی تێگەیاندبوو. دەیگوت:

– ڕوئیا خانم لە خۆشییان خەنی بووە و گوتویەتی «با ئەو محەمەدی حاجی زادەیە هەر سبەینێ بەڕێ کەوێت و بێتە گرۆنۆبڵ!».

ساقی گوڵچین دەیگوت:

– ڕوئیا خانم دەڵێ «ئەگەر محەمەدی حاجی زادە ناتوانێ بێتە لام بۆ گرۆنۆبڵ، من خۆم دێمە پاریس بۆ لای ئەو».

پێش ئەوەی پاریس جێ بهێڵێ بە دوو ڕۆژ، ئێمە هەموومان دانیشتبووین، ساقی گوڵچین بە محەمەدی حاجی زادەی گوت:

– ڕوئیا خانم دەڵێ «ئەگەر حەزدەکا لە هوتێل بێ، ئەگەر حەزدەکا لە ماڵی خۆم بمێنێتەوە. هاتوچۆی ئەمسەر و ئەوسەری دەدەمەوە، سێ جەمە نانخواردنیشی دەعوەتی منە.. چ پارە و دەسهەقێکیشی دەوێ دەیدەمێ.. بەس بێت!». ڕوئیا خانم ژنێکی دەوڵەمەند و نەجیبزادەیە، چی پارەیەکی لێی داوا بکەی، دەتداتێ.. بەس بچیتە لای.

ساقی گوڵچین دوو ڕۆژ پێش ئەوەی پاریس جێ بهێڵێت، لەپێش هەموومان بە محەمەدی حاجی زادەی گوت:

– بەڵام من بە مەرجێک ئەم کارەت پێ دەبەخشم.

– مەرجەکە چییە؟

ساقی گوڵچین بە محەمەدی حاجی زادەی گوت:

– دەبێ کارێکی وا بکەی کە ڕوئیا خانم ئەو پیاوەی لەپێش چاو ڕەش ببێت و چیتر بیر لەوە نەکاتەوە کە شووی پێ بکا!

محەمەدی حاجی زادە یەکسەر گوتی:

– بۆ؟ ئنجا بەڵکو پیاوە مەغریبییەکە بەڕاستی خۆشی دەوێ؟

ساقی گوڵچین گوتی:

– نەخێر خۆشی ناوێ، من دەزانم، تەنیا لەبەر موڵک و سامانەکەیەتی کە مرخی لێی خۆش کردووە.

– تۆ پیاوەکە دەناسیت؟

– ئەی چۆن؟ ناوی موبارەکە، مەغریبییە.

ساقی گوڵچین مکووڕ بوو لەسەر مەرجەکەی خۆی:

«هەر چۆنێک بێ؛ من هەرگیز ئیزنت نادەم بچی نیازخراپیی پیاوێکی مەغریبیی ناکەسبەچە، کە تەنیا لەپێناو موڵک و میراتەکەی مرخی لە ڕوئیا خانم خۆش کردووە، بچی بیکەیتە عەشق و ئایدیاڵ لای ژنێکی نەجیبزادەی وەک ڕوئیا خانم، کە دەڵێی پەپوولەیە پەپوولە!

من ڕوئیا خانمم خۆش دەوێ».

ساقی گوڵچین فێمینیست بوو، وا پێ دەچوو بیەوێ بەرگری لە ژیانی ئەو ژنە ئێرانییەی هاوڕێی خۆی بکات و نەهێڵێت چارەنووسی بێوەژنێکی بەستەزمانی نەجیبزادەی وەک ڕوئیا خانم بکەوێتە چنگ «پیاوێکی عەرەبی مەغریبیی ئەوتۆ» کە وەک ساقی گوڵچین دەیگوت تەنیا لەپێناو میرات و سەروەتەکەی مرخی لێی خۆش کردووە. گوتی:

– ئنجا ڕوئیا خانم بەوە نییە کە بێوەژنە؛ ژنێکی تا بڵێی جوان و نازداریشە. بیبینی، عەینەن گوگووشی گۆرانیبێژە.. هێندە شۆخ و شەنگ!

ساقی گوڵچین، بەئاشکرا هێز و باوەڕی فێمینستانەی خۆی، بەنیازی بەرگریکردن لەو بێوەژنە کەساسە، دووپات کردەوە:

– بەڵێ؛ من بەم مەرجە دەتنێرمە لای ڕوئیا خانم کە چارەنووسی ئەم ڕوئیا خانمە لەدەست ئەو پیاوە مەغریبییە ڕزگار بکەیت و کارێکی وا بکەیت کە ئەو پیاوە عەرەبەی لەپێش چاو ڕەش بەکەیت. چونکە ڕێکخراوە فێمینیستەکەی

ئێمەش لە ئەمەریکا کار لەپێناو ڕزگارکردنی ئەم جۆرە ژنانە دەکا لەدەست زوڵم و زۆری ئەو جۆرە پیاوانەی کە دەیانەوێ ئافرەتی ئاوها بێکەس و خۆشباوەڕ بچەوسێننەوە.

محەمەدی حاجی زادە یان ئەوەتا یەکسەر باوەڕی بە بەڵگەکانی ساقی گوڵچین هێنا، یانیش ئەوەتا چونکە لەبەر بەرژەوەندیی خۆیدا بوو، لەوانەشە ئەویش لەناو خۆیدا کەوتبێتە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی کە ئەو خۆیشی بیر لە خۆشویستن و مارەکردنی ئەو ژنە پەنجا ساڵییە بکاتەوە.. یەکسەر بە (گرێبەستەکە) ڕازی بوو، گوتی:

– باشە.. بەڵام...

ساقی گوڵچین گوتی:

– کە دەست بە فاڵگرتنەوە دەکەی.. ئاوها بڵێ.. بڵێ «پیاوێکی ئەسمەری ورگن لە ژیانی تۆدا هەیە، خاڵێکی گۆشتن (کە زیاتر لە زیادەگۆشتێک دەچێ وەک لە خاڵ) لەسەر ڕوومەتی چەپی هەیە.. دەوروخولی تۆی داوە و پێت دەڵێ گووایە تۆی خۆش دەوێ؛ بەڵام باش ئەمە بزانە کە ئەم پیاوە تەنیا لەپێناو سەروەت و سامانەکەت مرخی لە تۆ خۆش کردووە؛ تۆی خۆش ناوێ».

ساقی گوڵچین ڕووی لە محەمەدی حاجی زادە کرد، وەک ئەمرێکی بەسەردا بکا: باش!

محەمەدی حاجی زادە گوتی: باش.

ساقی گوڵچین بە محەمەدی حاجی زادەی گوت:

– تۆ هەر ئەمەندە بە ڕوئیا خانم بڵێ و ئیتر هەقی هیچی ترت نەبێ!

ئنجا بە محەمەدی حاجی زادەی گوت:

– خۆ من دڵنیام، ئەگەر تۆ بەختی ڕوئیا خانم بخوێنێتەوە، هەقیقەتەکەش هەر ئاوهایە و ئاوها دەبێ!

ساقی گوڵچین، دوای ڕێککەوتن لەسەر بەڵێنەکەی محەمەدی حاجی زادە،

هەر هەمان شەو، دەم ودەست، ناونیشان و ژمارەی تەلەفۆنی ماڵەوەی ڕوئیا خانمی لە گرۆنۆبڵ لەسەر کاغەزێک نووسی و دایە دەست محەمەدی حاجی زادە و پێی گوت:

– هەر سبەینێ تەلەفۆنی بۆ بکە و بچۆ بۆ لای بۆ گرۆنۆبڵ.

محەمەدی حاجی زادە دوای گەڕانەوەی ساقی گوڵچین بۆ سان فرانسیسکۆ بە چەند ڕۆژێک؛ بە سواری شەمەندەفەر بەرەو گرۆنۆبڵ بۆ لای ڕوئیا خانم بەڕێ کەوت.

## ئایەتی "الروقیة الشرعیة"

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

– لە کاتی قاوەگرتنەوە بۆ ڕوئیا خانم، بە ڕوئیا خانمم گوت: «پیاوێکی ئەسمەری ورگن لە ژیانی تۆدا هەیە، خاڵێکی گۆشتن (کە زیاتر لە زیادەگۆشتێک دەچێ وەک لە خاڵ) لەسەر ڕوومەتی چەپیەتی.. دەوروخولی تۆی داوە و پێت دەڵێ گووایە تۆی خۆش دەوێ؛ بەڵام باش ئەمە بزانە.. ڕوئیا خانم.. کە ئەم پیاوە تەنیا لەپێناو سەروەت و میراتەکەت مرخی لە تۆ خۆش کردووە؛ ئەگینا تۆی خۆش ناوێ!».

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

– ئەگەر پێم گوتبا «ئەو پیاوە عەرەبە مەغریبییە بەڕاستی تۆی خۆش دەوێت»، ئەوا دڵنیابووم دووای چەند ڕۆژێک شووی پێ دەکرد و من بێکار دەمامەوە.

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

– ڕوئیا خانم ملیۆنێر بوو، بەتاقی تەنیا خۆی و سەگێکی بچکۆڵەی، لەناو تەلارێک دەژیا کە دەتگوت تەلاری وەزیرەکانی سەردەمی قاجارییەکانە. ئەو ژنە سەڵتەنەتخوازە بە بارتەقای گەنجی قارِوون سەروەت و سامانی هەبوو.

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

– ڕوئیا خانم نەخۆشییەکی زۆر سەیری هەبوو، دەیگوت (شەوان کاتێ دەنووم، قاچم فرێ دەدەم). بەشەوان قاچی چەپی لەکاتی نوستندا گیرۆدەی ئازارێک دەهات، ئەو ئازارە وای لێ دەکرد کە جار بە جار قاچی ڕابچڵەکێنێت و شەق بهاوێ بەبێ ئەوەی خەبەریشی ببێتەوە.

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

– جارێک ئایەتی (الرقیة الشرعیة)م لەسەر قاچی خوێند بۆ ئەوەی ڕاچڵەکین و فرێدانی قاچی بەشەوان نەمێنێ. چاکم کردەوە.

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

– بۆ ئەمەش دیسان هەزار فرەنکی بەخشیش دامێ، چونکە دەیگوت «دکتۆری دنیام کردووە، هیچ دوکتۆرێک نەیزانیوە چیمە».

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

– ڕوئیا خانم چەندین جار منی بۆ گرۆنۆبڵ بۆ لای خۆی بانگ کردەوە، هەر جارێکی دەچووم قاوەی بۆ بگرمەوە یان دەستی بۆ بخوێنمەوە؛ پێنج سەد فرەنکی دەدامێ.. خەرجیی هوتێل و نانخواردنیشم لەشێوەی (چەک) خاوەنی هوتێلەکە خۆی بۆ ئەوی دەنارده ماڵەوە.

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

– هەموو جارێکیش کە دەستیم دەخوێندەوە یان کە فاڵم بۆی دەگرتەوە، بە ڕوئیا خانم دەگوت: «پیاوێکی ئەسمەری ورگن لە ژیانی تۆدا هەیە، خاڵێکی گۆشتن (کە زیاتر لە زیادەگۆشتێک دەچێ وەک لە خاڵ) لەسەر ڕوومەتی چەپیەتی.. دەوروخولی تۆی داوە و پێت دەڵێ گوایە تۆی خۆش دەوێ؛ بەڵام باش ئەمە بزانە، ڕوئیا خانم، کە ئەم پیاوە تەنیا لەپێناو موڵک و ماڵ و میراتەکەت مرخی لە تۆ خۆش کردووە؛ ئەگینا تۆی خۆش ناوێ!».

محەمەدی حاجی زادە دیار بوو بیرەوەرییەکی زۆری لەگەڵ ڕوئیا خانم هەبوو؛ هەموو جار کاتێ باسی ئەو ژنەی دەکرد، دەیگوت:

– بەڕەحمەت بێ، ژنێکی ئەگەرچی ساویلکە و دڵساف بوو؛ بەڵام گەلێک بەخشندە و نەجیبزادە بوو.

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت کە (حەیف!)؛ ساقی گوڵچین بەتەلەفۆن ڕۆژێک لەناکاو پێی گوتووە کە ڕوئیا خانم شەوێک بە سەکتەی قەلبی دڵی

ڕاوەستاوە و مردووە. لەو ڕۆژەوە، محەمەدی حاجی زادە چەند جار تەلەفۆن بۆ ڕوئیا خانم دەکات.. هەرگیز وەڵام ناداتەوە.

محەمەدی حاجی زادە هەناسەی خەفەتی هەڵدەکێشا و دەیگوت:

– ویژدانم ئازارم دەدا.

دەمگوت: بۆچی؟

دەیگوت:

– دڵنیام ئەگەر بەدرۆش بووایە پێم گوتبا کە ئەو پیاوە عەرەبە مەغریبییە تۆی خۆش دەوێ، ئاوها لەناکاو تووشی ئەم سەکتە قەلبییە نەدەهات و زۆرتر دەژیا.

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت: خەتای من بوو.

محەمەدی حاجی زادە، بەڵام هەرگیز ئەم باس و خواسە تایبەتییانەی بۆ میوانەکانی ڕێستورانتی دیلان نەدەگێڕایەوە.

ئێوەی نیگارکیش زۆر بەختەوەرن چونکە دەتوانن (جوانی)
ڕەسم بکەن، لەکاتێکدا ئێمەی مرۆڤگەلی ئاسایی و
ئەکادیمی، تەنیا پاشماوەکانی ئەو جوانییەمان بۆ
دەمێنێتەوە.

بۆ ماوەی نزیکەی ساڵێک، گفتوگۆکانی من و مسیۆ لووسیانا تەنیا لە چوارچێوەی هۆڵی پێشوازیی هوتێلەکەدا بوو.

شەوێک مسیۆ لووسیانا، پێش ئەوەی شەوشادم لێ بکات و بڕواتەوە ماڵ، لێی پرسیم:

– ئەم کۆتایی هەفتەیە وەختت دەبێ دەعوەتێکت بکەم؟

لەگەڵ مسیۆ لووسیانا بەتەواوەتی برادەر بووین، گوتم:

– بەخۆشحاڵییەوە.

ئێوارەی ڕۆژی شەممەی داهاتوو، سەعات هەشتی ئێوارە، لە یەکێک لە ڕێستورانتە گرانبەهاکانی شانزێ لیزێ بە ناوی Samtoor ، بۆ یەکەمین جار لەگەڵ مسیۆ لووسیانا لە دەرەوەی (هوتێلەکەمان)، لەگەڵ یەکتر وەک دوو برادەر دانیشتین.

– پێشتر هاتووی بۆ ئەم ڕێستورانتە؟

من دەمزانی دەعوەتم دەکاتە ڕێستورانتێکی هێندە گرانبەها و لێوەشاوەی شەخسیەتی خۆی، گوتم: هەرگیز.

ئەم دانیشتنەمان لەو ڕێستورانتەدا دەرگای بۆ چەندین چوونە دەرەوەی دیکەمان کردەوە، هەر جارێکیش بۆ ڕێستورانت و قاوەخانە و بارێکی جیاواز.

مـسـیـۆ لووسـیـانا، شـەوێکیـان، کـە بردم بۆ بارێکی ئیسـپـانیـایی خـۆش (ژێرزەمـینێک مۆسـیـقـای ئیسـپـانی و فـلامـینکۆیان تێـدا دەژەنی بەناوی La Vida) بە منی گوت:

– تۆ لە من زیاتر پاریس دەناسی. ئەم بارە خۆشەت لەکوێ دۆزیوەتەوە؟

لەو شـەوانـەی کـۆتاییی هـەفـتـەدا کـە جـار بـە جـار لەگـەڵ مـسـیـۆ لووسـیـانا یەکـتـرمـان دەبینی و دادەنیـشـتین دەمـانخـواردەوە، هـەرگـیـز دەممان ڕانەدەوەستا. هـەمیشـە مەسـەلەیەک، باسێکی دیکە هـەبوو بۆ ئەوەی دەست پێ بکەینەوەو قسـەی لەسـەر بکەین.

پێکەوە باسـی سیاسـەتی ئـەمریکا و شـەڕی ئێـران و عێراق و ئەفغـانسـتان و فیلمەکانی جان پۆڵ مـۆندۆ و پێوەندییەکانی ئالان دیلۆن بە ڕۆمی شنایدەرەوە و نەخـۆشـیی ئایدز و مـۆسـیـقـای جـاز و دیپلۆمـاسـیـیـەتی یاسـر عـەرەفـات و جوانیی ژنی ڕۆهـەلات و بەراوردکردنی بە ئافـرەتی ئەوروپاییـەوە و فرۆشـتنی چەک لەلایەن ئەڵمانیا و فەرەنسـاوە بە عیراق و سـۆزانییەکانی سانت دونی و عـەشـقـە ناودارەکەی نێوان مـەولانا جـەلالەدینی ڕۆمی و شـەمـسـی تەبریزی و بەراوردکردنی ئەم عـەشـقـە بە عـەشـقی نێوان ڕامبـۆ و ڤـێرلێن و خۆکوشـتنی مارلین مۆنرۆ و هێزەکانی پەکەکە لە تورکیا و سێ ملیۆن بێکار لە فەرەنسا و IRA و فیلمە ناودارکەی یەڵماز گونەی و سـەدان باس و خواسی دیکە.

من چیرۆکەکانی سـەردەمی ڕاکردنی خـۆمم دەگێڕایەوە لە عێراقـەوە بەرەو ئێران و پاشان سـووریا و ئنجا پۆڵۆنیا و ئەڵمانیـا پاشانیش فەرەنسا؛ مسیۆ لووسـیـاناش باسی تۆژینـەوە و کـۆڕ و کـۆنفـرانسـە ئەکـادیمیـیـەکـانی خـۆی لەبارەی ڕۆهـەلاتناسی لـە زانکۆکـانی مـۆسکۆ و بـەرلین و واشنتـۆن هـەروەها گێـڕانەوەی جـەربـەزەییـیـەکـانی خـۆی لەو سـەفـەرانەی بەرەو ئەسـتـەمـبـۆڵ و نیـوودەلهـی و شـیـکـاگـۆ و پـەکین و سـاوپـاولۆ و شـەنگەهـای بینیـبـوونی، بەتایبـەتیش لە شـاری (دووشـەممـە)ی تاجیکسـتـان کە دەیگوت زۆر حەزدەکەم جارێکی دیکەش بچمەوە ئەوێ.

مسیۆ لووسیانا دەیگوت:

– لە شاری بۆمبای توریست هەمیشە دەکەونە هوتێلە پیس و ناجۆرەکانەوە. ئەگەر سەفەری ئەوێت کرد، پێشتر پێم بڵێ، من ناونیشانی هوتێلێکت دەدەمێ کە شایستەی تۆ بێت و ڕێزت بگرن. لەوێ من دەناسن. شەش حەوت جاران چوومەتە ئەوێ. هوتێلی (تاج محەل) ڕازاوەترین هوتێلی ئاسیایە؛ ئەگەر چوویتە ئەوێ، لەوێ دەعوەتی من دەبیت لەو هوتێلە تا دەگەڕییتەوە. هوتێلی (تاج محەل) هەشت سەد ژووری تێدایە، شارێکە لەناو دڵی بۆمبای.

من چیرۆکە ناخۆشەکانی سەردەمی سەدام حوسێنم بۆی دەگێڕایەوە کە بەهۆی کوردبوونمەوە لە زەمانی منداڵی و گەنجێتیی خۆمدا چەشتبوومن، ئەویش کارەساتەکانی سەردەمی باوکی و منداڵیی خۆی بۆم دەگێڕایەوە بەهۆی جوولەکەبوونیانەوە بەدەست نازییەکانی سەردەمی هیتلەر و ڕژێمی پورتوگاڵەوە.

من باسی فرووغی فەروخزاد، ئەو باسی حافزی شیرازی. من باسی کمال الملک، ئەو باسی فێرناندۆ پێسوا. من باسی ئالڤاردۆ دی کامپۆس، ئەو باسی سوهرابی سپەهەری. من باسی ئێدیت پیاف، ئەو باسی ئوم کەلسووم. من باسی مۆسیقای ڕاپ، ئەویش باسی سەمای ئەو دەروێشانەی کە لە (قۆنیا) یان لە بایەزیدی ئەستەمبۆڵ بینیبوونی.

هەرگیز باس و خواس و قسەمان نەدەبڕایەوە.

هەموو جارێکیش، پڕ بە دڵ دەمویست کە من حیسابی دانیشتن و خواردن و خواردنەوەکەمان بدەم، مسیۆ لووسیانا کاغەزی حسابەکەی هەمیشە ڕادەکێشایە بەردەم خۆی:

– بۆ من تەنیا ئیمزاکردنی چێکێکی بانقییە. ئاسانترە.

دەمگوت: هیچ نەبێ تەنیا جارێک!

هەرگیز نەیدەهێشت:

- ئێمە برادەرین.

شەوێک لەو شەوانەی پێکەوە بووین، لە پاریسی هەشتەم لەناو ڕێستورانتێکی تورکەکاندا، بە ناوی (کاروانسەرا) کە سەما و مۆسیقای عوسمانیی لێ بوو؛ من چووبوومە توالێت.. کاتێ هاتمەوە دابنیشم دیتم مسیۆ لووسیانا غەمگین غەمگین ئاگای لە مۆسیقا خۆشە عوسمانییەکە نەمابوو، تەماشای وێنەیەکی دەکرد. کاتێ منی بینی، وێنەکەی نەخستەوە باخەڵی، پیشانی دام.

تەماشای وێنەکەم کرد. وێنەکەی دایە دەستم، گوتی:

- تەماشای کە!

لە وێنەکە وردبوومەوە. وێنەی کچێکی یەکجار جوان بوو.

مسیۆ لووسیانا گوتی:

- حەزدەکەم وێنەی ئەم کچەم بۆ گەورە بکەی.

مسیۆ لووسیانا ماندوو دیار بوو. کاتی ئەوە هاتبوو هەستین بڕۆین، لێمی پرسی: «دەتوانی؟».

من تەماشای سیحری ڕۆهەڵاتییانەی کچەکەم دەکرد، بە بێ ئەدەبیم زانی دەمودەست لێی بپرسم: «ئەمە وێنەی کێیە؟»، گوتم:

- بێگومان.

بەڵام یەکسەر تێ گەیشتم: هەبێ و نەبێ ئەمە ئەو کچەیە کە بووەتە هۆی ئەو فیگاری و نائومێدییەی کە جارجاربەجار، لەناکاو، هەرچی هێز و ئومێد هەیە لەو پیاوە مەزنەی دەسەنێتەوە.

لە کۆتاییدا ئەو ڕۆژە هات مسیۆ لووسیانا چیرۆکی هەرە گرینگی ژیانی تایبەتیی خۆی بۆم بگێڕێتەوە..

سەعات هەشت و نیوی ئێوارە بوو، دەعوەتی ماڵی مسیۆ لووسیانا بووم. هەوەڵین جار بوو کە لە ماڵی خۆیان یەکتر ببینین.

ماڵێکی شاهانەی زۆر خۆش!

بەدرێژاییی ڕێڕەوەکە، کە دەچووەوە ناو دیوەخانی ماڵەکەیان، فەرشی ئاوریشمی ئێرانی و بەڕەی ڕەنگینی فیگەرەتیڤی ڕۆهەڵات بە دیوارەکانەوە هەڵواسرابوون. هەر یەکەیان وەک تابلۆیەکی بەهادار -نەک وەک کلیمێک- خۆیان دەنوواند. گوتم:

- ئەم قاڵی و کلیمانە، هەر یەکەیان ستایلێکی جیاوازن و هی شارێکن.

گوتی: بەڵێ، کلیمی ئێرانی هی ئەوە نین ڕایان بخەی.. دەبێ بە دیوارەوە هەڵبواسرێن تا جوانییەکەیان باشتر ببینین.

لەناو ڕێڕەوەکەدا، لەناو بەشی پێشەوەی دیوەخانە شاهانەکەی ماڵی مسیۆ لووسیانا ئەم شتانەم بینی - کە هەر یەکەیانی لە وڵاتێکەوە و لە شارێکەوە لەگەڵ خۆیدا هێنابوو.

شمشێر، ددانی فیل، مۆمدانی زیو، ئاڵای لە ئەتڵەس دروستکراو، قوتووی لە گەوهەر چێکراو، سندووقی ئاسنین، گوڵدانی دەستساختی چین، کەمەربەند، ساز، زینی ئەسپ، زرێ، بالیفی ئاوریشمین، تۆپی پیشاندەری دنیا، جزمە، شاخی کەرکەدەن، هێلکەی نەخشێندراوی وشترمرخ، تفەنگی برنۆ، تیر و کەوان، گورز، دوگمە و دۆلاب، مێزەر، حەوزی پڕ لە ماسی و گوێچکەماسی، بالیفی بە مرواری نەخشێندراو، زینی بە داوی زێڕ نەخشێندراو، چەقۆی دەسک بە ئەڵماس، گورزی دەسک بە یاقووت ڕازێندراو، سەعاتی چاڵمە، سەڵتەی بە کەوڵ، کیسەی لە پێستی سمۆرە دروستکراوی پڕ لە پارەی قاجارییەکان (دەستم لە زۆربەیان دەدا)، نێرگلەی سەر بە ئەڵماس، تەزبیحی دەنک گەورە، کڵاوخوودی پیرۆزە تێگیراو، خەنجەر، قڵنج، مەسینە...

هەموو ئەم شتانە، لەناو دیوەخانەکەدا، تیشکێکی کزی دزەکردوو لە پەنجەرەی هاوینی پاریسەوە بەسەریاندا پەخشان بووبوو.

لەناو دیوەخانە شاهانەکەدا وێنەیەکی زۆر گەورەی پیاوێکی ئەرستۆکرات، لەناو چوارچێوەیەکی بە زیو نەخشێندراودا، تانج و نەجمە لەسەر شان، زۆر

کەشخە و قۆز، گۆچانێکی دەسک خڕ بەدەستەوە ڕاوەستابوو.

– ئەمە باوکمە.

ئەمجارە سەرنجم دایە دیوارەکانی تر، بەسەر دیوارەکانەوە، لەناو چوارچێوەی گرانبەهای زێڕکەفتدا، چەندین سوپاسنامە و خەڵات و بڕوانامەی ڕێزلێنان لە ئەکادیمیاکانی ڕۆهەڵاتناسی و لە زانکۆکانی فەرەنسا و ئیسرائیل و رووسیا و ژاپۆنەوە بە دیوارەکانی ماڵەکەیدا هەڵواسرابوون. هەموویان ئەوەیان روون دەکردەوە کە مسیۆ لووسیانا یەکێکە لە تۆژەرە هەرە چالاک و پڕکارەکانی بواری ئێرانشناسیی زانکۆی سۆربۆن و نانتێغ -Nan terre لە پاریس.

کاتێ لە تەماشاکردنی ئەو هەموو خەڵات و بڕوانامە تەقدیرییانە بوومەوە کە هەموویان لەناو چوارچێوەی زێڕکەفتدا بە دیواری دیوەخانەکەوە هەڵواسرابوون، ئنجا تێ گەیشتم کە مسیۆ لووسیانا چ تۆژەرێکی پڕ کار و چالاکە لە بەستێنی ئێرانشناسی و ڕۆهەڵاتناسیدا؛ خەریک بوو پێی بڵێم: «من نەمدەزانی کە جەنابت تۆژەرێکی هێندە ناوداریت لە زانکۆی نانتێغ»؛ گوتم:

– تۆ نیوەی ژیانی خۆتت بە تۆژینە بەسەربردووە.

ئنجا کاتێ گەیشتینە ژوورەکەی خۆی و فەرمووی دانیشتنی لێ کردم، بەر لەوەی دابنیشم؛ پێش هەموو شتێک؛ تاکێک پێڵاوی کچانە سەرنجی ڕاکێشام کە بە ناوەڕاستی دیوارەکەوە، لەپشت سەری خۆی، واتە لەسەرووی مێزی نووسینگەکەی خۆیەوە، هەڵی واسیبوو!

پێڵاوێکی سپیی بچکۆڵە، ئەملاو ئەولا بە نوقتەی ڕەش، لەناو چوارچێوەیەکی زۆر جواندا.

ئەو چوارچێوە ڕازاوەیەی کە لە ناوەڕاستدا تاکە پێڵاوەکەی لە ئامێز گرتبوو – کاتێ لێی نزیک کەوتمەوە، دیتم بە دەزووی ئاوریشمی چینی چندرابوو. چوارچێوەکە هیچی دیکەی لەخۆ نەگرتبوو تەنیا ئەو تاکە پێڵاوە

بچکۆڵەیە نەبێ، سپی سپی، بەسەر دیوارەکەوە.

بۆ من ئەو تاکە پێڵاوە بچکۆڵەیە، بەسەر ڕووبەرێکی هێندە فراوانی دیوارەکەوە، لەناو چوارچێوەیەکی گەورەی دەزووی ئاوریشمیندا، زیاتر وەک تابلۆیەکی سەربەخۆ دەهاتە پێش چاو؛ تەکنیکێکی هونەری بوو. بەڵام باوەڕیشم نەدەکرد کە مسیۆ لووسیانا (ئەم کارەی) وەک تابلۆیەک و بەرهەمێکی هونەری بەوێدا هەڵواسیبێ. بۆیە پرسیم:

– ئەم تاکە پێڵاوە هی کێیە.. لەوێ؟

مسیۆ لووسیانا دووای زەردەخەنەیەک، گوتی:

– پۆرترێتەکەت تەواو نەکرد؟

گوتم: کام پۆرترێت؟

– پۆرترێتی ئەو کچەی کە گوتم وێنەی بکێشە!

وێنەکەم بیرکەوتەوە کە لەناو ڕێستورانتی (کاروانسەر)دا پێی دابووم گەورەی بکەم. گوتم:

– کچێکی زۆر جوانە. تۆ بڵێی بتوانم دەقاودەق وێنەی بکێشم؟

مسیۆ لووسیانا گوتی:

– ئێوەی نیگارکیش زۆر بەختەوەرن.

گوتم: بۆچی؟

گوتی: چونکە دەتوانن (جوانی) ڕەسم بکەن.

ئنجا گوتی:

– لەکاتێکدا ئێمەی مرۆڤگەلی ئاسایی و (ئەکادیمی)، تەنیا پاشماوەکانی ئەو جوانییەمان بۆ دەمێنێتەوە.

کە ئەم قسەیەی کرد، دەستی بۆ تاکە پێڵاوەکەی ناو چوارچێوەکە درێژ کرد:

– ئەم پێڵاوە...

قسەکەی بۆ تەواو نەکرا.

گوتم: هی کێیە؟

گوتی: هی ئەو کچەیە کە وێنەکەی ئەوم پێت دا تا گەورەی بکەی.

من ئاگام لێ نەبوو کە پێشتر –نازانم لەکوێ – وێسکیی خواردبووەوە. بۆنی وێسکی دەهات. من برسیم بوو. هەستی خۆم ڕاگرت؛ دیتم بۆنی گۆشتی برژاویش دەهات. مسیۆ لووسیانا لێمی پرسی:

– چی دەخۆیتەوە؟

– پەرداخێک شەرابی سوور.

نەمزانی ژنە خزمەتکارەکە لەپشتمانەوە ڕاوەستابوو، مسیۆ لووسیانا پێی گوت:

– هەر دوو بوتڵە تازەکان بێنە.

چەندین فەخفووریی جۆراوجۆری مەززە، لەناو ئەوانەدا فەخفوورییەک گۆشتی برژاویش داندرابوو، بەڵام من بەردەوام بیرم لە تاکە پێڵاوە هەڵواسراوەکەی ناو چوارچێوەی قەد دیوارەکە دەکردەوە. زۆر سەرنجڕاکێش بوو، دیسان تەماشایەکم کردەوە. زۆرم پێ جوان بوو.

مسیۆ لووسیانا، کە دانیشت، گوتی:

– ئینسان دەیان کچی خۆش دەوێ، بەڵام یەک جار عاشق دەبێ. وایە؟

قسەکەم پێ ڕاست بوو، گوتم: وایە.

بەرامبەر یەکتر دانیشتبووین، دەیویست جگەرەکەی دابگیرسێنێ. گوتی:

– ئەم کچە ناوی (زیبا)یە.

ویستم بڵێم (ئێرانییە)، گوتم:

– ئادگارێکی ئێرانیی هەیە.

مسیۆ لووسیانا کە دەستی کردە قسەکردن، پەنجەی زۆر بەنەرمییەوە، بە گوڵێکی وردی ناو پارچە کلیمێکی بچکۆڵەی سەر مێزەکەمان دادەخشاند. تەماشای گوڵە وردەکەی دەکرد بۆ ئەوەی تەماشای من نەکا:

– فەرهاد..! بۆ ماوەی چوار ساڵ من و ئەم کچە.. ئێرانییە.. یەکترمان خۆش دەویست.

یەکەم مژی لە جگەرەکەی دا، پشتی دایە قەنەفە چەرمەکە:

– تۆ باوەڕت بە خۆشەویستیی ئەفلاتوونی هەیە؟

کە ئەم قسەیەی کرد، زەردەخەنەیەک رووی گەشاندەوە:

– من تێ کەوتم. بەدەست خۆم نەبوو.

مسیۆ لووسیانا دەمێک بوو بوتڵی یەکەمی شەرابەکەی هەڵپچڕیبوو، ملی بوتڵەکەی لارکردەوە ناو لێوانەکەم:

– شەرابی سووری بۆردۆیە.

ئنجا لەناکاو سەری هەڵبڕی و تەماشامی کرد:

– دایکم، تەمەنی درێژ دەبێ ئینشاڵڵا.

گوتم: ئینشاڵڵا.

زانیم مسیۆ لووسیانا کەمێک مەستە.

پەرداخەکانمان لەیەکتر دا.

لێوانەکەی دانایەوە:

– لەدووای دایکم، من ئاخرین کەسی بنەماڵەکەمان دەمێنمەوە.

ئنجا دەستی بۆ قلە زەیتونێک درێژ کرد:

– خوشک، برا، خاڵ، مام، پوور، باوک.. من هیچ کەسێکم نەماوە. هیچ کەسێکم نییە. دەزانی؟

مسیۆ لووسیانا جارێکی تریش بۆمی باس کردبوو؛ سەرجەم ئەندامانی

بنەماڵەکەیان، هەندێکیان لە پورتوگاڵ، ئەوانی تریش بەدەست نازییەکانەوە، لەبەر جوولەکەبوونیان، قەتڵوعام کرابوون.

مسیۆ لووسیانا دیسان پێکەکەی هەڵگرت و لەناکاو زەردەخەنەیەکی بێهوودە کەوتە سەر لێوەکانی:

– هوتێلێک لە پاریس، هوتێلێک لە ئۆکسفۆرد، هوتێلێکی ترمان لە تەلئەبیب! ئاپارتمانێکمان لێرە، سێ ئاپارتمانمان لە ئۆکسفۆرد، چوار ئاپارتمانی دیکەمان لە تەلئەبیب، دوازدە دەرمانخانە لە دوازدە شاری جۆراوجۆری فەرەنسا، چەندین موڵک و ماڵی دیکەمان لەملا و لەولا! من چی لەم هەموو موڵک و سامانە بکەم دوای مردنی دایکم؟ دوای نەمانی من، ئاخۆ ئەم هەموو موڵک و ماڵ و سامانە بۆ کێ دەبێ؟

وەک ئەوەی بڵێ (پیف)، ئاخێزێکی بێباکانەی کرد:

– ئەگەر پیرەژنێکی بێوەژن بوومایە ڕێکخراوێکم بۆ یارمەتیدانی بێوەژنە بەدبەختەکان دادەمەزراند.

من یەکەم جارم بوو مسیۆ لووسیانا مەست ببینم. بەڵام دڵنیا بووم کە لەمە زیاتر تێ ناپەڕێنێ.

ویستی قسەیەک بکا، سەری لێم هێنایە پێشەوە. دەیویست بیرۆکەکانی کۆ بکاتەوە ئنجا بدوێ. سیمای، سیمای کەسێکی وەرگرت بپارێتەوە. دەستەکانی، کە هەڵدەلەرزین، هێنایە پێشەوە:

– بە زیبام گوت: «هەموو موڵک و سامانی خۆمت بەناو دەکەم.. بەس بەجێم مەهێڵە، مەڕۆ!».

دەمویست مسیۆ لووسیانا نەکەوێتە دۆخێکی سۆزناکی ئەوتۆ کە لەمە زیاتر بورووژێت. کەچی بەپێش من کەوت، گوتی:

– اتش عشق گر بر زند

بر مومن و کافر زند.

دەگەڕام بەدووای قسەیەک هێمنی بکەمەوە:

– ئێستاش هەر لە فەرەنسا دەژی؟

بە خەفەتێکی قووڵەوە وەڵامی دامەوە:

– گەڕایەوە بۆ ئێران. بەجێمی هێشت.

ئنجا تەماشای تاکە پێڵاوە هەڵواسراوەکەی قەد دیوارەکەی کرد:

– زیـــبا...!

منیش تەماشای تاکە پێڵاوەکەم کرد. جوان بوو.

(زیبا) بۆ ماوەی چوار ساڵ بوورسی خوێندنی لەلایەن کۆماری ئیسلامیی ئێـرانەوە پێ درابوو، بۆ ئەوەی لە پاریس لە قـوتابخـانەی (بۆزئارت Beaux Arts) بخوێنێت. دووای تەواوکردنی ماجستێر لە بواری شانۆ، دەگەڕێتەوە بۆ تاران.

زیبا کچی بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی تارانی بووە. هەرکە هاتووە بۆ پاریس، لە یەکەم هەفتەوە لەگەڵ مسیۆ لووسیانا یەکتریان ناسیوە و یەکتریان خۆش ویستووە.

هەر لە یەکەم ڕۆژی یەکترناسینیانەوە زیبا زانیویەتی کە مسیۆ لووسیانا جوولەکەیە و بەئەسڵ خەڵکی پورتوگاڵە، بەڵام نەیتوانیوە خۆی بەرامبەر خۆشەویستیی لووسیانا ڕابگرێت؛ پێوەندییەکەیان بەردەوام بووە تا ڕادەی ئەوەی کە مسیۆ لووسیانای بەتەواوەتی مەست و شەیدای خۆی کردووە.

مسیۆ لووسیانا دەیگوت کە بۆ ماوەی چوار ساڵ، بەردەوام، هەموو ڕۆژێک «پێکەوە نانیان خواردووە»، «پێکەوە خەونیان دیوە»، «پێکەوە هەناسەیان داوە».

لووسیانا لەناکاو لێمی پرسی:

– ژێر پردەکانی (پۆنت ماری) و (پۆنت نۆف) و (پۆنت ڕۆیاڵ) و (پۆنت میرابۆ)ت بینیوە؟

– ئەی چۆن؟

– بولڤاردە درێژەکانی سانت میشێل و سانت ژێرمەن دوپغێ و بەردەم سینەماکانی ئەو ناوەت بینیوە؟

– ئەی چۆن؟

– یەکە یەکەی ریستورانتەکانی مۆنتماختیش!

– بێگومان.

– مەیدانی ئۆپێرا و باستیل و سانت میشێل؛ بەردەم بووبوورگ، لادێفانس، باغی لووکزەمبوورگ؟ قاوەخانەکەی (لۆ پتیت ژوورناڵ)...؟

– بەڵێ، بێگومان هەموویانم دیوە.

مسیۆ لووسیانا، خەریک بوو بگری.

– من ناتوانم بەلای هیچ یەکێکیاندا تێپەڕ ببم. ناتوانم تەماشای هیچ ئینجێکی ئەو شوێنانە بکەم.. دەمرم.

لەدووای قسەیەک دەگەڕام کە مسیۆ لووسیانای پێ ژیر بکەمەوە. مسیۆ لووسیانا گوتی:

– من بەبێ (زیبا) بەڕاستی خەریک بوو دەمردم.

ئنجا گوتی:

– ساڵی پار، یەکێک لە تۆژینەوەکانم لەبارەی چوار ڕووبارەکەی (شیر) و (شەراب) و (ئاوی شیرین) و (هەنگوین) کە ئیبن عەرەبی باسیان دەکا لە بەهەشت هەن، لە کۆنگرەی تۆژینەوە ڕۆهەڵاتناسییەکانی پاریس، خەڵاتی یەکەمی وەدەست هێنا. ئەمە سێیەمین جارە تۆژینەوەی من، لە کۆنگرە ئەکادیمییەکاندا خەڵاتی یەکەم وەدەست بێنێ.

مسیۆ لووسیانا، یادی کڵپەی ئەو عەشقەی، تەواو وورووژاندبووی. گوتی:

– دایکم دەڵێ «برۆ سەفەر بکە! بگەڕێ!».

ئنجا بە هەستێکی بێهوودەوە گوتی:

– دایکم وادەزانێ کە بە گەڕان و سەفەرکردن دەتوانم زیبا لە مێشکی خۆمدا بسڕمەوە.

ئنجا لەناکاو گوتی:

– لە دوای ڕۆیشتنی زیبا، خووم دایە تۆژینەوە و نووسین.. نووسین لەبارەی مێژووی مۆسیقا لە ئێران، مێژووی پەیکەرتاشی لە ئێران، مێژووی ڕۆهەلاتناسی لە ئێران، مێژووی جوولەکەکان لە ئێران.. چونکە تەنیا لێکۆڵینەوە و نووسین فریام دەکەوتن بۆ ئەوەی بتوانم خۆم لەبیر خۆم ببەمەوە. تەنیا تۆژینەوە ئەکادیمییەکان دەیانتوانی ناڵەی جودایی و حەسرەتی دووریی زیبام ئەهوەن بکەنەوە.

پاشان دەستی درێژکرد بۆ دیوەخانەکە:

– ئەم هەموو بڕوانامە تەقدیری و خەلاتە جۆراوجۆرانەت بینی بەسەر دیواری دیوەخانەکەوە؟

دەستم لەسەر چۆکم دانابوو، ئاوڕم بۆ ئاراستەی دەستی دایەوە؛ وەک ئەوەی گوێ بۆ چیرۆکی سەرکەوتنەکانی پاڵەوانێک ڕابگرم، گوتم:

– بەڵێ.

مسیۆ لووسیانا بە ئاوازی قسەکردنی قارەمانێک کە لە شەڕێکی دۆڕاو گەڕابێتەوە، نائومێدی و هەستی هەرەس لە پەیڤەکانیەوە دادەچۆڕان:

– ئەم هەموو سەرکەوتن و شۆرەت و ئازایەتییەی من، ئەم هەموو تۆژینەوە و خەلات و لێکۆڵینەوانەم.. هەموویان موڵکی (زیبا)ن، چونکە هەموویان لەوەوە هاتوون کە من دەمویست (زیبا) لەبیر خۆم ببەمەوە.

ویستم بە لووسیانا بڵێم:

– ئەم هەموو لێکۆڵینەوانەت لەبارەی ئێران و ڕۆهەلاتناسییەوە، بۆ بەرزڕاگرتنی زیبا ئەنجام داوە.

لووسیانا بە گاڵتەکردنەوە بە خۆی، پێ کەنی:

– خەڵکیش وا تێ دەگەن کە من توێژەرێکی زۆر جیدی و گرینگم!

دیسان پێ کەنی:

– قوتابیەکانیشم وا تێ دەگەن کە من بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی و زانکۆ و ئەکادیمیا کارم کردووە.

مسیۆ لووسیانا زەردەخەنەیەکی بێهوودەی گاڵتەکردن بە خۆی لەسەر لێوەکانی؛ پەرداخەکەی بەرزکردەوە:

– هیچ کەس نازانێ کە ئەم بەرهەم و کتێب و خەڵاتانەی من، هەموویان بەرهەمی شکست و نائومێدییەکانی منن.

دەمویست ئەم مەسەلەیەی لەبیر ببەمەوە، پێکی شەرابەکەم دەست دایە و گوتم: نۆش..!

مەدام گالاتتی، دایکی مسیۆ لووسیانا، بەدرێژاییی ئەوکاتەی لە نووسینگەکەی مسیۆ لووسیانا دانیشتبووین، هیچ دەنگوباسێکی نەبوو. حەتمەن لە میوانداریيەک بووە ئەو شەوە.

مسیۆ لووسیانا لە زەنگەکەی تەنیشت خۆی دا و جگەرەیەکی دیکەی داگیرساند. ژنە خزمەتکارەکە لەبەردەمی قووت بووەوە:

– بەڵێ گەورەم!

بە زمانی پورتوگاڵی قسەیەکی بە خزمەتکارەکە گوت تێی نەگەیشتم. ئنجا بە منی گوت:

– پێم گوت کە دەمێکی تر ماسییەکەمان بۆ ئامادە بکات. برسیتە وانییە؟

گوتم: کەمێک.

«تۆ باسی ئەوەت لەگەڵ زیبا نەکردبوو کە دەتەوێ بیخوازیت؟».

ویستم ئەم پرسیارەی لێ بکەم، بەڵام دوایە پەشیمان بوومەوە، گوتم نەوەک

هەستی بریندار ببێ. لووسیانا تەماشایەکی پێڵاوەکەی (زیبا)ی کردەوە و سووکە زەردەخەنەیەکی کرد.

– زیبا..

وەک باسی منداڵێکی خۆشەویستی خۆی بکا.

– دەیگوت «خوێندنم تەواو کردووە و دەبێ بگەڕێمەوە».

من خۆ دەمزانی مسیۆ لووسیانا جوولەکەیە و زیباش کچە موسڵمانێکی شیعەی ئێرانی! بەڵام لەگەڵ ئەمەش پرسیم:

– بۆچی قبووڵی نەکرد مێردت پێ بکا؟

مسیۆ لووسیانا دیسان سووکە زەردەخەنەیەکی کرد:

– دەیگوت «ئەگەر ئەم باسە لەگەڵ باوکم بکەمەوە، هەر سەرم دەبڕن».

ئنجا گوتی:

– من تەنیا حەزم دەکرد بمێنێتەوە، لە پاریس بمێنێتەوە، لای من. هیچی ترم لێی نەدەویست.. تەنیا بمێنێتەوە.

مسیۆ لووسیانا دووایین پێکی شەڕابەکەی نایە سەر دەمی خۆیەوە و کەوتە گێڕانەوە:

– کاتێ زیبا کەوتە سەر گەڕانەوە بۆ ئێران، پێی گوتم «حەزناکەم بێیت بۆ فرۆکەخانە». زیبا دەبووایە بچێ لە وێستگەی شەمەندەفەری (نۆرد) سواری شەمەندەفەر ببێت، پێی گوتم: «تکات لێ دەکەم تەنانەت مەیەرە وێستگەی شەمەندەفەریش. دەزانی!».

نە من نە ئەو، چاومان بەرایی نەدەدا ساتەکانی خواحافیزیکردنی یەکتر ببینین. من بەردەوام پێم دەگوت: «مەڕۆ!».

دەمزانی هەر دەڕوا. بەڵام چاوەڕێی ئەوەشم دەکرد کە لەوانەیە هیچ نەبێ گەڕانەوەکەی خۆی دیسان هەفتەیەکی تریش دووا بخات. چونکە پێشتر، دوو جار گەڕانەوەی خۆی دووا خستبوو. ئەمە جاری سێیەمی بوو. دەیگوت:

«ناتوانم؛ هەر دەبێ بگەڕێمەوە».

پێم دەگوت: «هەرچی موڵک و سامانم هەیە بەناوت دەکەم.. با دایک و باوکت بزانن چەندێکم خۆشم دەوێی»؛ دەیگوت: «هەرکە بزانن تۆ جوولەکەیت، دەمودەست سەرم دەبڕن».

دەمگوت: «دێمە سەر دینی ئیسلام لەبەر خاتری تۆ.. دەبمە شیعە»؛ دەیگوت: باوکم گوتوویەتی دەبێ هەر ئێستا پاریس جێ بهێڵێت و بگەڕێتەوە تاران».

من دامنابوو، ئەگەر دایک و باوکی ڕازی بوونایە، بچم بەیەکجاری لە تاران بژیم. دایکیشم، لەبەر دڵی من ڕازی بووبوو. دەمکرد.

لەسەرەتادا بیرم لەوە دەکردەوە کە من، جگە لەوەی جوولەکەم، چەندین ڤیزەی ئیسرائیلیش بە پەساپۆرتەکەمەوە هەیە و چەندین جار هاتوچۆی ئیسرائیلم کردووە.. ئەمە حەتمەن کێشەم بۆ دەنێتەوە و گومانی جاسووسیم لەلای کۆماری ئیسلامیی ئێران بۆ دروست دەکات و لەوانەیە تووشی دەردەسەرییەکی زۆرم بکات. بەڵام دەمگوت لە کۆتاییدا کاتێ دایک و باوکی زیبا دەمبینن کە من بوومەتە موسڵمان و کچێکی ئەوانم مارە کردووە و بڕیارم داوە تا هەتایە لە ئێران بژیم، دڵنیا دەبوومەوە کە لەوانەیە بەگەرمییەوە پێشوازیشم لێ بکەن. کەچی (زیبا) دەیگوت: «ئیشەکە ئاوها ئاسان نییە کە تۆ تێی دەگەی». دەیگوت: باوکم گوتوویەتی «دەبێ دەمودەست بگەڕێتەوە تاران».

گەڕایەوە!

مسیۆ لووسیانا وەک ئەوەی باسی منداڵێکی خۆشەویستی بکا کە وڕکی گرتبێ، بەردەوام زەردەخەنەیەک بەسەر لێوییەوە، درێژەی بە گێڕانەوەکەی دا:

– لەناو وێستگەی شەمەندەفەری (نۆرد)، ئاژێری شەمەندەفەرەکە لێی دا. زیبا هێشتا لەسەر پلیکانەی ناو دەرگای شەمەندەفەرەکە، نەچووبووە ناو شەمەندەفەرەکەوە. من دەگریام، دەستیم گرتبوو.. لێی دەپاڕامەوە دەمگوت:

«مەڕۆ.. بەجێم مەهێڵە!». زیباش دەگریا، دەیگوت: «دەبێ بڕۆم».

مسیۆ لووسیانا قوڵپی گریانێکی لەناکاو ئاوازی دەنگی گۆڕی، بەڵام هەمیشە زەردەخەنەیەک بەسەر لێویەوە:

– نەمدەزانی چی بکەم بۆ ئەوەی نەهێڵم زیبا بەڕوا. پەلامارم دایە قاچەکانی، بۆ ئەوەی قاچی ماچ بکەم. کەوتمە سەر قاچەکانی و پاڕامەوە. تێر تێر پێڵاوەکانیم ماچ کرد. تەڕ بوو. بۆنێکی خۆش لە پێڵاوەکانی دەهات. ئاژێری شەمەندەفەرەکەش هەر لێی دەدا. زیبا لەسەر پلیکانەی ناو دەرگای شەمەندەفەرەکە هەر نەهاتە خوارەوە. هەر دەگریا و دەیگوت: نا.

ئاژێری شەمەندەفەرەکە بۆ دوایین جار زریکاندییەوە. لەو دەمەدا خەریک بوو دڵم شەقی دەبرد. کاتێ دیتم شەمەندەفەرەکە بەڕاستی بەرێ کەوت؛ هیچی دیکەم پێ نەدەکرا: قاچی چەپی زیبام گرت و پێڵاوەکەم لەبەری داکەند، گوتم بەڵکو نەڕوا!

مسیۆ لووسیانا قوڵپی گریان ئەوکی گرتبوو، نەیدەهێشت پەیڤەکانی ئاسان بێنە دەرەوە:

– شەمەندەفەرەکە ڕۆیشت، زیبای لەگەڵ خۆی برد... تەنیا تاکە پێڵاوەکەی قاچی چەپی زیبا لەناو دەستمدا مایەوە.

مسیۆ لووسیانا هۆن هۆن کەوتە گریان، بەڵام زەردەخەنەیەک هەمیشە بەسەر لێوەکانیەوە:

– شەمەندەفەرەکە ڕۆیشت، زیبای لەگەڵ خۆی برد. کاتێ شەمەندەفەرەکە بەتەواوەتی ئاوا بوو، تاکە پێڵاوەکەی زیبا لەناو دەستم تاقە شتێک بوو مایەوە. نام بە سنگی خۆمەوە...

مسیۆ لووسیانا ئاوڕێکی دایەوە بۆ تاکە پێڵاوەکە. بە سۆزێکی قووڵەوە تەماشای تاکە پێڵاوەکەی قەد دیوارەکەی کرد و بە حەسرەتێکەوە گوتی:

– تاقە یادگارییەکی عەشقی منە!

بەردەوام تەماشای تاکە پێڵاوەکەی قەد دیوارەکەی دەکرد:

– من ئەم پێڵاوەم لە پێی داکەند بۆ ئەوەی نەڕوا.

کاتێ تەماشای ئەم پیاوە شەیدا و هەستناسکەم دەکرد، نەمدەزانی چ وەڵامێکی فرمێسکەکانی بدەمەوە.

ئنجا، پێش ئەوەی داوام لێ بکا بچین ماسییەکەمان بخۆین، تەماشایەکی دیکەی تاکە پێڵاوەکەی کردەوە و گوتی:

– من هەمیشە کاتێ بیر لە زیبا دەکەمەوە، زەردەخەنەیەک دەکەوێتە سەر لێوەکانم.

## هوتێل "ئەوروپا"

چەندین ساڵ هەموو رۆژێک هەمان شت بکەیتەوە و هەمان رێگە بکوتیتەوە و هەمان شت ببینیتەوە و هەمان شت بخۆیت و هەمان شت بخۆیتەوە و هەمان قسە ببیستیتەوە.. بۆ من زۆر ناخۆش بوو.

چەندین ساڵ، هەموو رۆژێک هەمان هوتێل، هەمان کار، دووبارە هەمان مێترۆ، هەمان بۆنەکان، هەمان کەسەکان... دەمویست لەدەست ئەم رۆتینە رزگار ببم.

وەختێ کارێکی جیاواز دەدۆزیتەوە و پێ دەنێیتە جیهانێکی تازەوە، باوەرم وابوو، ژیانیشت مانای خۆی تازە دەکاتەوە و لەوانەیە بەرەو رێگایەکی خۆشتر و ئاسوودەتر پەلکێشت بکا.

بەکورتی، لەم ئیشی پاسەوانییەی (هوتێل ئەوروپا) وەرەس بووبووم.

هەموو رۆژێک سەعات هەشت و دە دەقیقەی بەیانی، میترۆی (پواسۆنییێغ)م دەگرت و سەعات هەشت و نیو دەگەیشتمە ماڵەوە، تا دەمەدەمی نیوەرۆ دەنوستم. پاش نیوەرۆ بەرەڵای شەقامەکانی پاریس دەبووم تا کاتی دەست پێکردنەوەی کارەکەم، سەعات هەشتی ئێوارە، دەبووایە دیسان لە پێشوازیی هوتێل ئەوروپا ئامادە بووبام، بەبێ تەنانەت یەک خولەک دوواکەوتن، چونکە لە ساتی دیاریکراودا، مسیۆ ڤیکتۆر، قولەرەشێکی خەڵکی (بورکینا فاسۆ) کە لە ماوەی رۆژەکەدا لەجێگەکەی من دەوامی دەکرد، دەبووایە هوتێل جێ بهێڵێت و بچێ بەدوای منداڵەکانی خۆیدا ک دەیگوت لە (ئەنتۆنی)ن و نزیکەی نیو سەعاتێک بە RER لە هوتێلەکەوە دووربوون؛ نەیدەویست دوابکەوێت و مێترۆی کاتی دیاریکراوی لەدەست بچێ.

هەموو ڕۆژێک لە هەشتی ئێوارەوە بۆ هەشتی بەیانی لە هوتێل ئەوروپا! ئەمە بوو ژیانی چەندین ساڵی ئەوکاتەی من لە پاریس.. لەگەڵ ئەو دوو ڕۆژە شیرینەی شەموو و یەکشەم، بێگومان، کە بوو زۆربەی پاریسییەکان، وەک من، تاقە دوو ڕۆژێکی پشوودان بوو لە ژیانیاندا.

ماوەیەکی زۆر بوو هەستم دەکرد کە هیلاک؛ کەمێکیش بێزار بووبووم لەم ئیشە. بۆیە هەندێ جار تەنانەت بیرم دەکردەوە هەر بەیەکجاری بگەڕێمەوە وڵاتەکەم!

ئەو هاوینە بیرم کردەوە بچمە کەناری بەڵتیک؛ لەوێ بژیوی ژیانم بە پۆرترێت کێشان دەستەبەر بکەم، دروستکردنی کاریکاتێر بۆ توورستەکانی قەراغ دەریا.

شوان، هاوڕێیەکی نیگارکێشی دێرینم، لە دورگەی سانت مالۆ، دەمێک بوو پێشنیازی بۆ کردبووم کە ماوەیەک بچم بۆ لای و دورگەی سانت مالۆ بۆ کارکردن تاقی بکەمەوە.

دورگەی سانت مالۆ!

زۆر حەزم دەکرد، ئەگەر تەنیا بۆ هاوینەکەش بێ، بچم هەندێک لەوێ کاربکەم.

ئەگەر بە محەمەدی حاجی زادەم گوتبا کە بێت لە شوێنەکەی من کاربکات، هیچ نەبێ بۆ ماوەی تەنیا ئەو چوار مانگەی هاوین تا من لە قەراغ دەریا دەگەڕێمەوە، دەمزانی لە کەیفخۆشییان هەر شاگەشکە دەبوو.

لەناکامدا بڕیارم دا بە محەمەدی حاجی زادە بڵێم کە بێت بۆ ماوەی تەنیا چوار مانگ لە شوێنی من لە هوتێل (ئەوروپا) کار بکات.

بەڵام تۆ بڵێی مسیۆ لووسیانا بەم پێشنیارەم ناڕەحەت نەبێت؟

تۆ بڵێی ئیزنم بدا بۆ ماوەی ئەم چوار مانگە هوتێلەکەیان جێ بهێڵم و مەلایەکی ئێرانی جێگەکەم بگرێتەوە؟

## شاری سان فرانسیسکۆ لەسەر یازدە گرد دامەزراوە
## بەڕاستی شاری نیگارکێشەکانە

– کاتێ دەگەیتە ئەورووپا، بەس نییە تەنیا ڕۆژهەڵاتی بیت.

مورتەزا گوڵچین لە محەمەدی حاجی زادەی پرسی:

– مەبەستت چییە لەم قسەیە؟

– ئێمەی مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی، کاتێ دێینە ئەورووپا، بەس نییە تەنیا ڕۆژهەڵاتی بین.

من دەمزانی مەبەستی محەمەدی حاجی زادە ئەوە بوو کە بڵێت (وەختێ مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی دێتە ئەورووپا، پێویست وایە خۆی لەگەڵ نەریتی ئەورووپا بگونجێنێت و فێر ببێت وەک ئەوان بیربکاتەوە)؛ ویستم مەبەستەکەی محەمەدی حاجی زادە بۆ مورتەزا ڕوون بکەمەوە – نەوەک بە هەڵە لێی تێ بگات و وابزانێ توانجی تێ دەگرێ.

– ئاغای حاجی زادە دەیەوێ بڵێ «مرۆڤی ئێرانی بێزار دەبێ هێندەی لە ئەورووپا هەمیشە هەر ئێرانییانە بژیت. ناشتوانێ».

مورتەزا چەند مانگێک بوو لە فەرەحنازی ژنی جودا بووبووەوە، گوتی:

– من بەتەواوەتی لەگەڵ ئەم ڕایەدام. ڕاستە. هەر ئەمەش بوو هۆی جودابوونەوەی من و فەرەحناز. تا هەتایە ئێرانیبوون بۆ ئێمە بەس نەبوو، منیش و ئەویش پێویستیمان بە (شتێکی دیکە) هەبوو.. پێویستیمان بە کەسێکی (ئەورووپی) هەبوو.

محەمەدی حاجی زادە گوتی:

- ژن و مێرد بوون لە ئەوروپا زیاتر وات لێ دەکا هەر ڕۆهەڵاتی بمێنیتەوە.

ساقی گوڵچینی خوشکی مورتەزا لە سان فرانسیسکۆوە (بە قسەی خۆی) بۆ ئەوە هاتبوو کە دیسان سەرێک لە مورتەزای برای بدا- بەتایبەتیش چونکە لەو کاتەوەی مورتەزا لە فەرەحنازی ژنی جودا بووبووەوە نەهاتبووە لای.

ساقی گوڵچین تازە لە توالێت هاتبووە دەرێ، بە نووکی پەنجە، تاڵەکانی پەرچەمی خۆی هەڵدەدایەوە. هات لەسەر کورسییە چاڵە چەرمینەکەی بەرامبەر من (لەو جێیەی کە پێشتریش هەر لەوێ دانیشتبوو) دانیشت. هەرکە دانیشت و دانەنیشت دانەیەک پستەی لەسەر مێزەکە هەڵگرت، بە دوو پەنجەی سەری نینۆک زۆر سوورەکانی، خستیە نێوان دوو ددانی خۆی و قرتەی لێ هێنا:

- «ژن و مێرد بوون لە ئەوروپا زیاتر وات لێ دەکا هەر ڕۆهەڵاتی بمێنیتەوە».

ساقی گوڵچین ئەم قسەیەی محەمەدی حاجی زادەی دووبارە کردەوە.

ئنجا کاتێ توێکڵەکەی خستە ناو تەپڵەکەکەوە، زۆر بە جیدییەوە ڕووی کردە محەمەدی حاجی زادە:

- ئەمە قسەیەکی زۆر جوانە. زۆریش ڕاستە.

ئنجا دانەیەکی دیکەشی لە پستەی سەر مێزەکە، بە دوو پەنجە نینۆک زۆر سوورەکانی، هەڵگرت و دیسان زۆر بە جیدییەوە ڕووی کردەوە محەمەدی حاجی زادە:

- تۆ لەو ماوەیەدا... ئاخر من دەمێکە نەمدیوی... ئاغای حاجی زادە.. پێشکەوتنێکی زۆر بەسەر بۆچوونەکانتدا داهاتووە. من ئەم قسەیەتم زۆر بەدڵە. زۆر ڕاستە. بەڵام ئایا بە ڕای جەنابت.. کەپڵ بوونیش هەر وات لێ دەکا؟.. کەپڵ بوونیش هەر وات لێ دەکا ڕۆهەڵاتی بمێنیتەوە، بە ڕای تۆ؟

ساقی گوڵچین کە ئەم قسەیەی کرد، مەکرۆیانە زەردەخەنەیەکی بۆ من کرد

و چاوێکی بۆ نوقاندم.

محەمەدی حاجی زادە دەیویست لە مەبەستی پرسیارەکەی ساقی گوڵچین تێ بگات:

- مەبەستت؛ ئەگەر تەنیا کەپڵی یەکتر بن و ژن و مێرد نەبن؟

- بەڵێ!

- دەکەوێتە سەر ئەوەی کە...

ساقی گوڵچین وەک ئەوەی پێشوەختە وەڵامەکە بزانێ، لێی پرسی:

- ئێوە قبووڵتانە کەپڵێکی ئێرانی پێکەوە بژین و.. ژن و مێردیش نەبن؟

محەمەدی حاجی زادە گوتی:

- بێگومان. بێگومان، خانم. کە دەچیتە شاری کوێران دەبێ دەست بە چاوتەوە بگری!

ساقی گوڵچین گوتی: براڤۆ! جاران ئاوها بیرت نەدەکردەوە.

محەمەدی حاجی زادە ڕووی کردە من و ویستی بە حەنەکەوە قسەکە بکا:

- جاران تەنیا (كمال الملك)م دەناسی، هێشتا پیکاسۆم نەناسیبوو.

ساقی گوڵچین، ڕووی لە محەمەدی حاجی زادە، ئاماژەیەکی بۆ پێڵاوە کەچە و دڕاوەکەی کرد.. بە حەنەکەوە پێی گوت:

- دەزانی، تۆ ئەگەر ئەم پێڵاوانەت بچێنیت، حەتمەن شتێکیان لێ سەوز دەبێ!

ساقی گوڵچین ئەم تانووتەی لێ دا، بێ ئەوەی تەنانەت زەردەخەنەیەکیش لەسەر ڕووی هەبێ. مورتەزای برای، کە گوێی لەم قسەیە بوو، پێکەنینەکەی خۆی شاردەوە. ئنجا ساقی گوڵچین ڕووی لە محەمەدی حاجی زادە کردەوە.

- ئێستا لە کوێ کاردەکەی، ئاغای حاجی زادە؟ هێشتا هەر ئیقامە فەرەنسییەکەت وەرنەگرتووە؟

محەمەدی حاجی زادە گوتی:

– نەخێر. بەڵام ئاغای فەرهاد خەریکە کارێکی تازەی بۆم دۆزیوەتەوە. لەمەودووا دەچم لە هوتێل ئەوروپا، لەجێگەکەی ئەو کاردەکەم.

– هیوادارم قەناعەت بە ساخبێری هوتێلەکەم بێنم.

ساقی گوڵچین ڕووی کردە من:

– دڵنیام قەراغ دەریای... گوتت ناوی ئەو دورگەیە چی بوو؟

– سانت مالۆ.

– باندەستی زۆری دەبێ بەسەر ئەو تابلۆیانەی لە داهاتوودا ڕەسمیان دەکەی. پێت خۆشە دەچیتە ئەوێ؟

گوتم: دەمێکە دەمەوێ بچم لە قەراغ دەریا کار بکەم.

مورتەزای برای ساقی، بۆ موجامەلە نا، هەر بە جیدی بوو، ڕووی لە من کرد:

– ئاغای فەرهاد، بەڕاستی، بۆچی نایەی لە سان فرانسیسکۆ کار بکەی؟

مورتەزا وا بریاری دابوو، بەتایبەتیش پاش ئەوەی لە فەرەحنازی ژنی جودا بووبووەوە، بچێت لەگەڵ ساقی گوڵچینی خوشکی لە سان فرانسیسکۆ بژیت.

ساقی گوڵچین، پێشتریش، بەدرێژاییی ئەو دانیشتنەمان، جار جار بیری دەخستمەوە و دەیویست هانم بدا لەگەڵیان بچمە سان فرانسیسکۆ و لەوێ بژیم. دووای ئەم پێشنیارەی مورتەزای برای، سەرلەنوێ دەستی پێ کردەوە:

– سان فرانسیسکۆ لەسەر یازدە گرد دامەزراوە، چەندین تراموا لە هەر شوێنێکەوە ئامادەن بتگوازنەوە بۆ ئەو باڵەخانەی بڵندانەی کە لێیانەوە دەتوانی دەریا ببینی. سان فرانسیسکۆ بەڕاستی شاری نیگارکێشانە!

ساقی گوڵچین دەیویست هانم بدا بڕیاربدەم منیش بچم لەوێ کاربکەم:

– سان فرانسیسکۆ درەوشاوەترین شاری ئەمریکایە. وەرە..!

محەمەدی حاجی زادە گوتی:

– برۆ.. بۆ خۆت لەوێ دەبیتە ملیۆنێر.

ساقی گوڵچین گوتی:

– من لە گەڕەکی (ئۆکلاند)م کە کاتی خۆی جاک لەندەن لەوێ دەژیا.

ئنجا درێژەی بە وەسفکردنەکانی دا:

– سان فرانسیسکۆ لەناو مارکێت ستریت (شەقامی مارکێت)ەکەیدا، دە جۆر نەژاد و میللەتی جۆراوجۆر، لەبەردەم سینەمایەکدا، لەکاتی سینەما بەربووندا، سەرلەنوێ تێکەڵ بەیەکتر دەبنەوە. سان فرانسیسکۆ، ئەو شارەیە کە تێیدا خەڵک گوێیان لە باشترین مۆسیقای جازی ئەمریکاش دەبێ.

لەو دەمەدا من تەماشای محەمەدی حاجی زادەم دەکرد، لەناو هەر چوارماندا تەنیا ئەو بوو بێ پەساپۆرت، بێ کار، بێ ئیقامە، بێ ماڵ و حاڵ! لەناو چاوەکانیدا باش باش ئەوەم دەخوێندەوە کە چەندێک هەست بە کەمی و کەماسی دەکا لەدەست ئەوەی کە ئەو وەک ئێمە پەساپۆرت و کار و ئیقامەی نییە.. تەنانەت ناتوانێ سەفەرێکیش بکا. گوتی:

– منیش، ئەگەر ئیقامەم هەبوایە دەهاتم.

وەک ئەوەی وەڵامی بداتەوە، ساقی گوڵچین گوتی:

– سان فرانسیسکۆ، لە ناوەڕاستی گەڕەکی چینییەکانی خۆیدا پەیکەرێکی لێیە پێی دەڵێن (سون یات- سین) کە پەناهەندە سەرخۆش و لانەواز و بێکارەکان لەژێریدا کۆدەبنەوە و نیوەشەوان وادەزانن ئەوێ ژووری نوستنی ماڵی خۆیانە.

ئنجا دووای پێکەنینە کورتەکەی، ڕووی کردەوە محەمەدی حاجی زادە:

– سان فرانسیسکۆ بە حەپسخانەی (ئالکاتراز)یش بەناوبانگە.

محەمەدی حاجی زادە بیرەکەی بەردەم خۆی تەواو کردبوو، بێدەنگ، نازانم بیری لە چی دەکردەوە. ساقی گوڵچین لە محەمەدی حاجی زادەی پرسی:

- گوتت كە تۆش حەزدەكەی بێیت لەوێ بژیت؟

محەمەدی حاجی زادە زەردەخەنەیەكی لەخۆڕازییانەی كرد:

- بۆ نا.

ساقی گوڵچین گوتی: بۆ نا؟

ئنجا بێ ئەوەی تەماشای هیچ كەس بكات، درێژەی دایە تانووتەكانی:

- لە نزیك تەلەگراف هێل، لە گەڕەكی نۆرث بیچ، ڕێستورانتێكی چینیی لێیە بەناوی (ذە سیلەر The Cellar)، جاران نووسەرانی (نەوەی بیت Beat) تێیدا كۆدەبوونەوە؛ كەچی ئێستا بووەتە جێگەی ئەو پەنابەرە بێ ئیقامە و بێ ماڵ و حاڵانەی كە دێن لەوێ حەشیشە دەكێشن؛ بۆتە مەنزڵگەی ئەو بێ ئیقامە بەدبەختانەی كە بەدووای هۆمۆسێكسیوێڵەكاندا دەگەڕێن تا لەگەڵیاندا ببنە برادەر و پێكەوە بژین یان هیچ نەبێ بۆ ئەوەی ئەو هۆمۆسێكسوێڵانە بیانبەنەوە ماڵی خۆیان و هیچ نەبێ چەند شەوێك جێگەیان بۆ بكەنەوە. لە سانت فرانسیسكۆ زۆرن ئەو هۆمۆسێكسوێڵانەی دەیانەوێ پەناهەندەیەكی بێكار و بێ ماڵ بكەنە هاودەمی خۆیان.

باندەستی ئەم تانووت و قسانەی ساقی گوڵچین بەسەر دەروونی محەمەدی حاجی زادە زۆر كاریگەر بوو.

یەكسەر زانیم كە محەمەدی حاجی زادە حەزی دەكرد لەو دەمەدا دەمودەست، لەدەست ڕووزەردی و شكستی خۆی، لە پرمەی گریان بدات و بچێتە دەرەوە.

پێش ئەوەی محەمەدی حاجی زادە بچێت لە (هوتێل ئەوروپا) لە جێگەی من دەست بە کار بکا، من پێشتر ڕەزامەندیی مسیۆ لووسیانام بەشێوەیەکی گشتی وەرگرتبوو. دایکەکەشی ڕازی بووبوو: پیاوێکی ئێرانی، کە کاتی خۆی لە تاران مەلا بووە و ئێستا لە پاریس چاوەڕێی مافی پەناهەندەیی دەکا؛ بۆ ماوەی تەنیا هاوینەکە دێت لە جێگەی من، لە هوتێلەکە بە ڕەش کار دەکا!

ڕاستییەکەی، مسیۆ لووسیانا، دەمزانی ئەگەر لەبەر خاتری من نەبووایە، هەرگیز ئامادە نەبوو پەناهەندەیەک قبووڵ بکا -کە هێشتا مافی پەناهەندەیی بۆ دەریش نەچووە - بە نیوەکرێ لە هوتێلەکەیاندا کاربکات. چونکە ئەم کارە، واتە کاری ڕەش، لە هەموو فەرەنسا قەدەغە بوو و مانای ئەوەی دەگەیاند کە خاوەنی هوتێلەکە و فەرمانبەرەکەش نایانەوێ بچن باج بدەنە حکوومەت.

پاش ئەوەی ڕەزامەندیی مسیۆ لووسیانام بەشێوەیەکی گشتی وەرگرت و باوەڕم پێی هێنا کە ئەمە بۆ ماوەی تەنیا چوار مانگێک دەبێت و بەڵێنیشم دایە کە دووای ئەم چوار مانگە خۆم بگەڕێمەوە سەر کارەکەم؛ محەمەدی حاجی زادەم بردە لای مسیۆ لووسیانا بۆ هوتێلەکە و بەیەکترم ناساندن.

مسیۆ لووسیانا کاتێ محەمەدی حاجی زادەی دیت کە سەر و سیما و باڵا و هەموو شتێکی، هێندە لە ئەو دەچێ؛ زۆر کەیفی هات. بەردەوام پێ دەکەنی و خۆی پێ ڕانەدەگیرا.

محەمەدی حاجی زادەش بەهەمان شێوە، واقی وڕمابوو؛ چۆن دەکرێ پیاوێکی فەرەنسی، تا ئەو ڕادەیە لەو بچێ؟!

لە کۆتاییدا، هەر هەمان ئێوارە، مسیۆ لووسیانا ڕەگەزنامە ئێرانییەکەی لە

محەمەدی حاجی زادە وەرگرت و فۆتۆکۆپیی کرد و لای خۆی لەناو چەکمەجە کلیلدارەکەی تایبەت بە هوتێل دāینا. هەردووکیان لەسەر ئەوەش ڕێک کەوتن کە بە هەمان مووچەی پێشووی من؛ محەمەدی حاجی زادە هەموو ڕۆژێک (تەنیا شەممو و یەکشەمووان نەبێ) لە سەعات هەشتی ئێوارەوە تا هەشتی بەیانی لە پێشوازیی هوتێلەکەیاندا کاربکات.

– لە وێنەی ناو پەساپۆرتەکەشتدا چەندێک لە من دەچی!

ئەمە دووایین قسە بوو کە من گوێم لێ بوو مسیۆ لووسیانا، بەدەم زەردەخەنە و تەماشاکردنی ڕەگەزنامە ئێرانییەکەی محەمەدی حاجی زادەوە، لەودیوی مێزەکەی خۆیەوە بە محەمەدی حاجی زادەی گوت.

ئەو ئێوارەیە، تەنیا من و مسیۆ لووسیانا و محەمەدی حاجی زادە بووین، دایکی مسیۆ لووسیانا لەوێ نەبوو؛ وا ڕێک کەوتین کە بۆ دووسبەی، واتە لە ڕۆژی (سێشەم) بەملاوە، سەعات هەشتی ئێوارە، محەمەدی حاجی زادە بێت لە (هوتێل ئەوروپا) دەست بە کار بکا.

ڕۆژی سێشەم، لە وێستگەی شەمەندەفەری (گارد دو نۆرد)، سەعات حەوت و نیوی ئێوارە، هەموو لایەک خواحافیزیمان لە یەکتر کرد و هەر یەکەمان بەرەو لایەک ڕۆیشتین. مورتەزا –کە تازە چەند مانگێک بوو لە هومەیدای ژنی جودا بووبووەوە– لەگەڵ ساقی گوڵچینی خوشکی بەرەو فرۆکەخانەی شارڵ دیگۆل بەڕێ کەوتن، محەمەدی حاجی زادە بەرەو هوتێل ئەوروپا، منیش مێترۆم گرت و بەرەو پاریسی پێنجەم، بەرەو (کولانەکەی) خۆم، بۆ ئەوەی جەنتاکانی خۆم بپێچمەوە و چەند ڕۆژێکی تر بۆ سبەینێ بەرەو دورگەی سانت مالۆ Saint Malo بەڕێ بکەوم.

## یەکەمین دوو پۆستکارت

## کە لە سانت مالۆ بەدەستم گەیشت

من ئەمە دووەم جارم بوو بچمە سان مالۆ Saint Malo . جاری یەکەم، هاوینی پێرار بوو، دەعوەتی (شوان چاوشین)ی هاوڕێم، تەنیا بۆ ئەوە چووبووم کە چەند ڕۆژێکی پشووی هاوینە لەوێ بەسەر ببەم و جوانیی ناوچەکە ببینم. شوانی هاوڕێم دەیگوت:

– گیۆفروا دۆڤێرگن Dauvergne، گەورە نیگارکێشی فەرەنسا، لەوێ لەدایک بووە و ژیاوە. هەر دەبێ بێی شاری دۆڤێرگن ببینیت! پێکەوە دەچین سەرێک لە مۆزەخانەکەیشی دەدەین.

بەڵام ئەم جارەیان ستاند و بۆرد و بنەوبارگەی خۆشمم لەگەڵ خۆم بردبوو، بە نیازی ئەوەی هیچ نەبێ بۆ ماوەی چوار مانگ لە کاتی هاویندا لەوێ بژیم و لە قەراغ دەریا کار بکەم.

پێش ئەوەی بگەمە ئەوێ، شوان چاوشین، کە ساڵانێکی زۆر بوو لەوێ دەژیا و یەکێک بوو لە نیگارکێشە (ناسراوەکانی) قەراغی دەریا و کاری پۆرترێتی لەوێ دەکرد، ئاپارتمانێکی بچکۆڵەی بۆم بەکرێ گرتبوو. بۆیە هەرکە گەیشتمە ئەوێ، دەمودەست (شوان) منی بردە ناو ماڵێکی ئامادە.. بەشێوەیەک کە تەنیا دوو ڕۆژ دووای گەیشتنم، لە قەراغ بەڵتیک کەوتمە سەر دروستکردنی پۆرترێت.

لە وەڵامی ئەوەدا کە من دوو پۆستکارتی جوانم بۆ محەمەدی حاجی زادە و مسیۆ لووسیانا، بە ناونیشانی هوتێل ئەوروپا ناردبوو بۆ ئەوەی لە ژمارەی تەلەفۆنی ماڵەکەم و لە ناونیشانی تازەی خۆم لە سانت مالۆ ئاگاداریان

بکەمەوە؛ محەمەدی حاجی زادە پۆستکارتێکی (بورجی ئیڤڵ)ی لە پاریسەوە بۆم ناردبوو و لەسەری نووسیبوو (سوپاس)؛ مسیۆ لووسیاناش پۆستکارتێکی میناتۆری ئێرانیی بۆم ناردبوو لەسەری نووسیبوو: «غەریبیت دەکەم..».

هێشتا دوو هەفتە هەڵنەسووڕابووەوە، شەوێکی درەنگ، محەمەدی حاجی زادە تەلەفۆنێکی بۆ کردم بۆماڵەوە:

– ئاغای فەرهاد.. دایکی مسیۆ لووسیانا، ئەمڕۆ بەیانی کۆچی دوایی کردووە. بۆ ئاگاداریت!

## سێیەمین پۆستکارت

فەرهادی ئازیز،

مسیۆ لووسیانا پێریّ شەو دەیگوت کە بە تەلەفۆنەکەی تۆ (کە بەبۆنەی کۆچی دوایی دایکییەوە بۆت کردبوو) دڵی زۆر خۆش بووە.

هەرگیز نەمدەزانی مسیۆ لووسیانا تۆی هێندە خۆش دەویّ! هەر جارێک کە بۆ قاوەخواردنەوەیەک دێتە لام، باسی تۆ دەکا. هەمیشە کە من دەبینیّ، باسی تۆ دەکا.

من خەریکم خۆم فێری زمانی پورتوگاڵی دەکەم. پێنج رۆژە ناوی خۆم لە خولێکی فێربوونی زمانی پورتوگاڵی تۆمارکردووە و هەموو پاشنیوەرۆیەک بۆ ماوەی سێ سەعات زمانی پورتوگاڵی دەخوێنم. مسیۆ لووسیاناش زۆر هانم دەدا.

ئەی تۆ چۆنی؟

خاتوو ساقی لە سان فرانسیسکۆ وە پۆستکارتێکی بۆت ناردبووە ناونیشانی هوتێلەکە، وا لەگەڵ ئەم نامەیەی خۆم و ئەم نامانەی تردا بۆت دەنێرم.

هاورێت

محەمەدی حاجی زادە – ١٩٩٤/٦/٢٥

## چوارەمین پۆستکارت

ئازیزەکەم، فەرهاد گیان..

هیوادارم لە سانت مالۆ هەموو شتێکت باش بەڕێوە بچێت.

ستایلە سیحراوییەکەی خۆت بپارێزە. لەبیر نەکەی، من هەمیشە گوتوومە «تۆ ستایلێکت هەیە، لەناو هەموو نیگارکێشە کوردەکانی پاریسدا تۆ تاکرەوترینیت!».

کەی بێم سەرێکت لێ بدەم و تابلۆ تازەکانت ببینم؟ چاوەڕێی وەڵام و ژمارەی تەلەفۆنی تازەتم. زوو.

بە یادی هەموو ئەو شەوە خۆشانەی کە لە ئامێزی گەرم و بۆنخۆشی تۆدا ڕۆژم دەکردەوە... ماچێک.

هاوڕێت

ساقی گوڵچین – ١٩٩٤/٧/٢٧

پێنجەمین پۆستکارت

همخویش را بیگانه کن، همخانه را ویرانه کن

و انگه بیا با عاشقان همخانه شو، همخانه شو!

فەرهاد گیان،

من بەڕاستی دەمەوێ سەرهەڵبگرم؛ بۆ تەنیا ڕۆژێکیش بێت (زیبا) ببینمەوە.. بەڵام نازانم چۆن؟

لووسیانا – ١٩٩٤/٨/٢٠

لە سانت مالۆ یەکەمین جار بوو لە ژیانمدا هەستم بە تەنیایی خۆم کرد، بەتایبەتیش ڕۆژێکیان کاتێ لەژێر پەیکەرەکەی (ڕۆبێرت سوورکۆف R. Sur-cauf ) ڕاوەستابووم کە ئەلفرێد کاراڤانێز Caravaniez دروستی کردبوو. ئەو پەیکەرەی ڕۆبێرت سوورکۆف، قەڵافەت و ئادگاری، دەقاودەق لە باوکم دەچوو. کەوتمە سەر بیرکردنەوە لە باوکم و دایکم و خوشک و براکانم کە زیاتر لە یازدە ساڵ بوو نەمبینیبوون. ئەسڵەن – چونکە پێوەندیی تەلەفۆنی لەگەڵ عیراق هەمیشە پچڕابوو– تەنانەت بە تەلەفۆنیش قسەم لەگەڵیان نەکردبوو. نەمدەزانی ئێستا لەکوێن و چییان بەسەرهاتووە؟! تەنیا هێندەم دەزانی کە لەدووای کۆڕەوەکەوە لە ساڵی ١٩٩١، هەموویان لە سنووری تورکیاوە گەڕاونەتەوە هەولێر و سەلامەتن.

بۆ یەکەم جار بوو غەریبییان بکەم و کەڵکەڵەی ئەوە بکەوێتە سەرمەوە بچم سەرێک لە کەسوکاری خۆم بدەمەوە لە هەولێر، هیچ نەبێ بۆ ئەوەی بتوانم دایکم ببینمەوە. بەتایبەتیش چونکە ئەوە چەند ساڵێک بوو، لە ڕاپەڕینی ١٩٩١ بەملاوە، حکوومەتێکی نیمچە ئۆتۆنۆم لە کوردستانی عێراق دامەزرابوو و دوور بوو لە هەموو دەسەڵات و زەبروزەنگێکی سەدام. دەمتوانی ڤیزەیەکی سووریا یان ئێران وەربگرم و لەوێوە بچم بیانبینمەوە. بۆ نا؟ غەریبیکردنی کەسوکارم بەتایبەتیش (دایکم) هەمیشە دڵی دەکرۆشتم.

بۆ یەکەم جار لە سانت مالۆ بوو کە کەڵکەڵەی بینینەوەی دایکم و کەسوکارم بەڕاستی کەوتە مێشکمەوە. ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتریش غەریبیی دایکم و شارەکەم و کەسوکاری خۆمم دەکرد. ڕاستییەکەش، زۆر جاران لەناو نۆستالجیای خۆمدا بە خۆمم دەگوت: «ئەوا چەندین ساڵە من لە ئەورووپا

دەســـوورێمـــەوە؟ من لێـرە کـێم؟ .. چیم؟ مـن لە ئەورووپا مـــانام چییــە؟ کێ دەمناسێ؟».

لەو مـــاوەیەدا لە ســـانت مــالۆ ، نازانم بۆچی، بیـرم بەردەوام لە قســـەیەک دەکردەوە کە کاتی خۆی، لە سەرەتای یەکتر ناسینماندا، مسیۆ لووسیانا پێی گوتبووم:

– برۆ برنج و نیسک و نۆک لە کوردستانەوە بهێنە و لێرە بیانفرۆشەوە!

مسیۆ لووسیانا بەبیرمە بەتانووتەوە لێمی پرسی:

– تۆ دەتەوێ بە نیگارکێشان دەوڵەمەند ببیت؟

گـوتم: «نـەخـێـر، بەهـۆی نیگارکـێـشـانەوە زیـاتر دەمــەوێ هونـەری خـۆم و ناسنامەی کورد بە ئەورووپا بناسێنم».

مسیۆ لووسیانا لە وەڵامی ئەم قسەیەی مندا گوتی:

– ئەگەر مەبەسـتت دەوڵەمـەندبوون بێ یان مـەبەسـتت ناسـاندنی ناسـنامـەی کــورد بە ئەورووپا، لە هەر دوو حـــاڵەتدا تۆ بە نیـگارکـێـشـــان نـاتوانیـت لەم ئامانجەی خۆتدا سەربکەویت.

گوتم: بۆچی؟.

گـوتی: چونکە تۆ چـەنێک لە نیگارکـێشـــاندا شـارەزا و بلیـمـەتیش بیت، هـەرگیز ناتوانیت کێبەرکێ لەگەڵ ئەم گەورە هونەرمەندانەی ئەورووپا بکەیت کە بلیمەتی و هونەرەکەیان لە کەسانی وەک داڤینشی و پیکاسۆوە بۆ ماوەتەوە!.

مـسـیـۆ لووسـیـانا کـە جـوولەکـە بوو، بەڕاسـتـی بە عـەقـڵێکی جوولەکـانی دەیڕوانییە مەسەلەکە، دەیگوت:

– بۆیە، بە ڕای من وا باشـتـرە تۆ بچیت برنج و نیسک و نۆکی کوردسـتـان بـهـێنیـتـە ئێـرە و لێـرە بیـانفرۆشـیـتـەوە. تۆ بەم شـێـوەیە باشـتـر دەتوانیت دەوڵەمەند ببیت و کورد بە ئەورووپا بناسێنیت.

تۆ هـەرگـیـز ناتوانیت نـاسنامـــەی خـــۆت و ناسنامــەی کـــورد لە ڕێگەی

نیگارکێشانەوە بگەیەنیتە ئەوروپا، چونکە ئێوەی کورد هەرگیز ناتوانن لە ڕووی هونەرییەوە مونافەسە لەگەڵ ئەوروپا بکەن».

دووای ئەم هەموو ساڵ نیگارکێشان و کاری هونەرییە لە پاریس، بیرم لەم قسانەی مسیۆ لووسیانا دەکردەوە و بە خۆمم دەگوت: «ڕاستە! ئەوا یازدە ساڵ زیاترە من لە ئەوروپا نیگار دەکێشم؟ .. من کێم؟ گەیشتوومەتە چی؟.. چیم؟ من لە ئەوروپا مانام چییە؟».

ئەم پرسیارانە لەبارەی ناسنامەی هونەری و شەخسیی خۆمەوە دڵی ڕنەک دەدام و زیاتر دەیخستمە سەر کەڵکەڵەی گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەم.

لە سانت مالۆ، هەمیشە تا سەعات یازدەی بەیانی دەنوستم. کاتێ لە خەو هەڵدەستام، دووای فراڤین، دەچووم لە بالکۆنەکەمەوە -هەموو جار، لێم بووبووە خوو، چەند دەقیقەیەک بەدەم جگەرەکێشان و قاوەخواردنەوەی سبەینانەوە لەسەر کورسیەکەم دادەنیشتم و.. لەو فرۆکە سنگ و بەرۆک سپی و جوان و زەبلاحانە ورد دەبوومەوە کە لە فرۆکەخانەی (دینارد Dinard)ەوە هەڵدەستان و بەسەر سەرمدا تێ دەپەڕین، وا بزانم بەرەو ڕۆهەڵات دەڕۆیشتن. ئنجا ئیتر دەستم دەکردە وێنەکێشان و.. تا سەعات سێی پاشنیوەڕۆ هەر لە شوقەکەی خۆمدا دەمامەوە. ئنجا لە سەعات سێی پاشنیوەڕۆوە دەچوومەوە قەراغ دەریا، لەناو ئەو خەڵکە تووریستانەی لە هەموو ئەورووپاوە هاتبوون، ستاند و بۆردەکەم دادەنا و تا نیوەشەو سەرقاڵی پۆرترێت دروستکردن دەبووم بۆ تووریستەکان.

بەم شێوەیە، ژیانم لە سانت مالۆ لێوانلێوی نیگارکێشان و قازانج و کارکردن بوو، بەڵام لەگەڵ ئەمەش، نازانم بۆچی هەستم بە تەنیاییەکی کوشندە دەکرد و سۆزێکی غەریبی، سەرتاسەری ڕۆحمی هەپروون بە هەپروون کردبوو. نازانم چی بوو؛ زۆر بەتاسووقەوە غەریبیی ڕەگوڕیشەکانی خۆمم دەکرد.

ئایا هۆیەکەی ئەوە بوو کە هیچ هاودەم و هاوڕێیەکی کچم لە سانت مالۆ

نەبوو؟ ئایا غەریبیی پاریسم دەکرد؟ یان هۆیەکەی ئەوە بوو کە لە پاریس بە دیمانەی مسیۆ لووسیانا ڕاهاتبووم و مسیۆ لووسیانا بۆ من وەک باوکێک و هۆگرێکی ڕۆحیی لێ هاتبوو؟

زۆر بیری مسیۆ لووسیانام دەکرد، بیری گفتوگۆ خۆشەکانی.

جارێکیان، هەفتەیەک پێش ئەوەی پاریس بەجێ بێڵم، لە باسکردنی (زیبا)ی خۆشەویستەکەیدا بەبیرمە مسیۆ لووسیانا پێی گوتم:

– وەهم بۆ مرۆڤ لە هەقیقەت زۆر پێویستترە!

گوتم: چۆن؟

گوتی: وەهم هیوات پێ دەدا، ئومێدێکت دەداتێ.

من لە دیدی خۆمەوە، باوەڕم وابوو کە هونەرمەند ئەگەر لەناو وەهمدا نەژیت و وەهمی نەبێت ئەسڵەن ناتوانێ بژیت و ناشتوانێ هیچ داهێنانێک بکات، بەڵام ئەوەم بەلاوە زۆر سەیر بوو کە ئاخۆ، بۆ کەسێکی وەک مسیۆ لووسیانای ملیۆنێر، توێژەرێکی ئەکادیمی، خاوەن چەندین هوتێل و موڵک و سامان.. وەهم چ مانایەکی هەیە؟ بۆچی دەبێ وەهم بۆ ئەو پێویست بێ؟!

دووای کۆچی دووایی‌کردنی دایکی، لەوە دەچوو مسیۆ لووسیانا تووشی هەستی تەنیایی و حاڵەتێکی نیگەرانیی زۆر هەژەند هاتبێ.

لە نامەکانیدا بۆنی ئەوەم دەکرد کە هەست بە تەنیایی دەکات و بێزارە؛ هەستم دەکرد دەیەوێ ژیانی خۆی بگۆڕێ.

لە نامەیەکیدا باسی ئەوەی کردبوو کە دایناوە بەیەکجاری بچێت لە تەلئەبیب بژیت و هەرگیز نەگەڕێتەوە پاریس، نووسیبووی: «ئەوە چەند ڕۆژێکە دوکتۆرانامەکەم تەواو کردووە. لە زانکۆی تەلئەبیبەوە لە بەشی ڕۆهەڵاتناسی، داوایان لێ کردووم بچم لەوێ وانە بڵێمەوە. زۆر لەوانەیە بچم».

کەچی لە نامەیەکی دیکەدا نووسیبووی: «بەهۆی ئەوەی کە لێرە، لە فەرەنسا، خوا نەماوە؛ لەوانەیە لە داهاتوودا بچم بۆ هیندستان.. بەڵکو لەوێ

لەناو ئەو هەموو خوایانەی لە هیندستان هەن خوایەک بدۆزمەوە و بەختەوەرم بکا».

کەچی لە نامەیەکی دیکەیدا نووسیبووی «لەوانەیە بچم بۆ ئۆرشەلیم.. لەوێ، تێکەڵ بە خاک و خوێن و ڕەچەڵەکی خۆم ببمەوە».

لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو کە لە گەرمەی خوێندنەوەی ئەو نامە تەنیا و بێزارانەی مسیۆ لووسیانادا، محەمەدی حاجی زادە نامەیەکی بۆم ناردبوو تێیدا (بە خەتێکی درشت) نووسیبووی: «بەینی خۆمان بێ؛ بۆم دەرکەوتووە کە مسیۆ لووسیانا جاسووسی ئیسرائیلە؛ مانگی جارێک دەچێتە تەلئەبیب. وابزانم زۆر حەزیش دەکا بچێتە ئێران».

من لە سانت مالۆ، دووای خوێندنەوەی نامە بێزار و تەنیاکانی مسیۆ لووسیانا، گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە ئەو وەهمەی من لەناوی دەژیام و هیوای پێ دەبەخشیم، هونەر بوو.. ئەو وەهمەی کە مسیۆ لووسیاناش لەناوی دەژیا و هیوای پێ دەبەخشی، (زیبا) بوو.

«زیبا تاقە شتێکە کە من لەژیانمدا دڵم پێی خۆش بێ!».

مسیۆ لووسیانا لە دواین نامەی خۆیدا، ئاوهای نووسیبوو.

## کارێکی پێویست

بە بۆنەی تەواوکردنی دوکتۆرانامەکەیەوە، پۆستکارتێکی پیرۆزباییم بۆ مسیۆ لووسیانا ناردبوو.

دووای ئەوە، شەوێکی زۆر درەنگ، کە من تازە لە قەراغ دەریا گەڕابوومەوە ماڵ، مسیۆ لووسیانا تەلەفۆنێکی بۆ کردم و داوای لێ کردم کە:

– یان ئەوەتا تۆ وەرە پاریس، یانیش ئەوەتا من دێمە لات.

گوتم: مەسەلە چییە؟

گوتی: پێویستیم پێت هەیە و دەمەوێ هەندێ قسەت لەگەڵ بکەم.

من کە بە هیچ شێوەیەک نەمدەتوانی دڵی مسیۆ لووسیانای هاوڕێم بشکێنم، گوتم، باشە، من دێمە پاریس.

گوتی: ئاخر.. هەر سبەینێ!

گوتم: هەر سبەینێ.

– لە بەرێکەوتنتەوە تا گەڕانەوەت.. دەعوەتی منی، وەرە.. دەی!

– هەر سبەینێ.

## سەروەت و سامان و پارە
## دەستەوەستان نەماونەتەوە

سێ مانگ زیاتر بوو پاریسم بەجێ هێشتبوو.

کاتێ گەیشتمەوە پاریس، ئێوارەیەکی درەنگ، مسیۆ لووسیانا لەناو ئاپۆرەی وێستگەی شەمەندەفەری (ئۆستەرلیچ) راوەستابوو چاوەڕێمی دەکرد. لە جەنتای شانم زیاتر هیچ شتێکی دیکەم پێ نەبوو. مسیۆ لووسیانا یەکەم جاری بوو بێتە پێشوازیم، بۆیە نەیدەزانی کە من لە کاتی سەفەردا هەمیشە لە جەنتایەکی شان زیاتر هیچی دیکە لەگەڵ خۆم هەڵناگرم.

– بەڕاست؟

– ڕقم لە بار و جەنتای زۆرە لەکاتی سەفەر.

مسیۆ لووسیانا لێمی پرسی:

– کام ڕێستورانتت لە پاریس زۆر پێ خۆشە؟

باران نم نم بەسەر شەقامەکەی بەردەم وێستگەی شەمەندەفەردا دەباری. دڵم زۆر خۆش بوو کە دوای سێ مانگ دیسان پاریس دەبینمەوە، تەماشای بارانە تریسکاوەکەی ناو ئاسمانی ڕەشی پاریسم دەکرد. مسیۆ لووسیانا لەگەڵ من ئەویش تەماشایەکی بارانەکەی دەکرد و گوتی:

– (زیبا) زۆر حەزی لە پیاسەی ژێر باران بوو!

مسیۆ لووسیانا زۆر لەوە ساغڵەمتر دیاربوو کە من چاوەڕێم دەکرد، لە نامەکانی و لە دەنگی تەلەفۆنەکانیدا (لە سانت مالۆ) وا هەستم دەکرد کە لەدوای کۆچی دواییی دایکییەوە گەلێک بێزار و بێ تاقەت بووبێ. بەڵام دیتم

بەپێچەوانەوە، وەک هەمیشە زۆر ساغڵەم و خۆشگوزەران بوو.

تا گەیشتینە ناو ئوتومبیلەکەی، بەدرێژاییی ئەو ڕێگەیە، لەژێر باراندا، باسی باران و ئەو ڕۆژانەی دەکرد کە لەگەڵ زیبا چۆن لەژێر باراندا بەجووتە شەقامەکانی پاریسیان تەی کردووە، چۆنیش ئێستا هەر جارێک کە باران دەبارێ (زیبا)ی بیردەکەوێتەوە.

لەناو ئوتومبیلەکەیدا، بەدەم داتەکاندنی تنۆکە بارانەکانی سەر شانی، بە شوفێرەکەی خۆی گوت:

– ڕێستورانتی لێ زامباسادۆر Les Ambassadeurs لە مەیدانی کۆنکۆرد.

سەعات دەوروبەری نۆ و نیوی شەو بوو، ڕۆژی پێنج شەم.

جاران لەو کاتانەدا، واتە لە سەعات دەوروبەری نۆ و نیوی شەودا، ئەگەر من لە پاریس بوومایە، لە هوتێلەکە ئەلبوومێک بەدەستەوە تەماشای تابلۆکانی نیگارکێشێکی پۆست مۆدێرنم دەکرد؛ دووای ئەمەش دەچوومە کافتیریای هوتێلەکەوە و بەدەم قاوەیەکەوە دەستم دەکردە تابلۆکێشان. ئەمە جاران، بەڵام ئێستا من ئەمەتام لەگەڵ خودی خاوەن هوتێلەکە، دەعوەتکراوم و بەرەو ڕێستورانتێکی خۆش دەچین لە مەیدانی کۆنکۆرد!

دەبێ چی رووی دابێ؟ باوەڕم نەدەکرد شتێکی خراپی وا ڕووی دابێت پێوەندیی بە محەمەدی حاجی زادەوە هەبێ.

بێدەنگ، وەک جەنتڵمانێک نەیەوێ لەبەردەم شوفێرەکەی خۆیدا هیچ نهێنییەک بدرکێنێ، لە چەند وشەیەکی هاورێیانە زیاتر بۆ موجامەلەکردنی من، هیچی دیکەی لەناو ئوتومبیلەکەدا نەگوت. بەدێژایی ڕێگا تەنیا تەماشای سەمای جوانی بارانەکەی ئەودیو پەنجەرەی دەکرد بەسەر نایتکلەب و درەخت و قاوەخانە و ڕێبوارەکاندا.

ناو ئوتومبیلەکەی، گەرم و خۆش بوو. گوێم لە دەنگی شارڵ ئازناڤوور لە تۆماری ئوتومبیلەکەوە. بۆنێکی سەیر دەهات، بەڵام بیرم هەر لەلای محەمەدی حاجی زادە بوو. تۆ بڵێی پۆتێکی شکاندبێت و من بەهۆیەوە شەرمەزار بووبم؟

لەوانەشە مسیۆ لووسیانا تەنیا غەریبیی کردبم و حەزبکا بگەڕێمەوە سەر کارەکەم. هیوای ئەوەم دەخواست کە هۆی ئەم داواکردنە بەپەلە و لەناکاوەی مسیۆ لووسیانا هەر ئەمە بێت.

خۆم پێ ڕانەگیرا، پرسیم:

- حاجی زادە چۆنە؟

لووسیانا گوتی:

- باشە، دەیەوێ خۆی فێری پورتوگاڵی بکا. تۆ چۆنی؟

- باش.

ئنجا بەچرپە سەری لە بناگوێم نزیک کردەوە:

- هەندێ قسە هەیە، نەدەکرا بە تەلەفۆن باسی بکەین.

دەستیشی لەسەر چۆکم دانا.

بەم شرۆڤەکردنە، دڵم زیاتر کەوتە ختوورەوە.

محەمەدی حاجی زادە دەبێ چیی کردبێ؟ چی ڕووی دابێ؟

محەمەدی حاجی زادە بە تەلەفۆنی هوتێلەکە، هەفتەی بە لای کەمییەوە جارێک، شەودرەنگان، تەلەفۆنی بۆ دەکردم بۆ سانت مالۆ. جاری وا هەبوو چارەگەسەعاتێک قسەمان پێکەوە دەکرد. هەرگیز باسی تۆزقاڵێک چییە ناخۆشی و هیچ گرفتێکی نێوان خۆی و مسیۆ لووسیانای نەکردبوو. ئەدی کەواتە چییە مەسەلە؟

لەناو ئوتومبیلەکە نیگەران دانیشتبووم و بیرم بەتەنیا بۆ یەک شت چوو:

جاران، ئەو کاتەی من لە هوتێلەکە بووم، نیوەشەوان، زۆربەی جاریش لەدووای سەعات دە و نیوی شەو بەملاوە، پیاوێکی دەوڵەمەندی عەرەب، یان پیاوێکی ئەفریقی -بەشێوەیەکی گشتیش زۆربەی جار ئاسیایی- خۆی و ژنێکی سۆزانیی نیوەڕووت لە زەنگی دەرگای هوتێلەکەیان دەدا و دەرگەم لێ دەکردنەوە.. دەهاتن لەبەردەم نووسینگەی پێشوازیی هوتێلەکە داوای

ژوورێکیـان دەکرد «بـۆ مـاوەی تەنیـا نیـو سـەعـات» یان بۆ مـاوەی تەنیـا یەک سـەعات. لـەو کـاتانەشـدا ئەو جـۆرە مـیوانانە هـەمـان نرخی ئاسـایـی شـەوێک مانەوەیان بۆ دوو کەس دەدا.

من لەو کاتانەدا بێگومـان دەمـزانی کـە تەنیا نـیو سـەعات لەناو ژوورەکەدا دەمـێننەوە. پێـشـومختـە کـرێی (٣٥٠) فـرەنکم لێ وەردەگـرت ئـنجـا کـلیلی ژوورەکەم دەدانێ.

کاتێ ئیشـی خۆیان تەواو دەکرد، دەهاتنە خـوارەوە و کلیلەکەیان دەدامێ و دەڕۆیشتن.

محەمەدی حاجی زادە لە تەلەفۆن، دەیگێڕایەوە دەیگوت:

– ئەم نەوعـانە زۆر دێن. ئـەفریقـی، تورک، بەتایبـەتی عـارەبی دەوڵەمـەندی سـعـوودی و سـووریایی. جـارێکیـان بەحـرێنیـیـەک هـات، حـاجـی بوو، دیشداشـەیەکی سـپـیی لەبەر، بەو شـەوە، ژنێکی سـۆزانیی فـەرەنسـیی لەگەڵ خـۆی هێنابووە بەردەم پێشوازییـەکە. ئەو دەوڵەمـەندە بەحرێنییـە ڕەش ڕەش ڕەش، ژنە فەرەنسییەکەش دەتگوت پەنیرە، سپی سپی سپی.

محەمەدی حاجی زادە لە تەلەفۆن، دەیگێڕایەوە:

«هەفتـەی بەلای کـەمـییـەوە پێنـج شـەش کـەسـی لـەم جـۆرە دێنە هوتێلەکە. دەزانی! ئەرێ ئەوە کاتی تۆش هـەر وا بوو؟

شـەوی وا هـەیە، سـێ چـوار ژوور بەم شـێـوەیە بـەکـرێ دەدەم.. بـەتایبـەتی ڕۆژانی کـۆتاییی هـەفتـە. هەر عـارەبێکی دەوڵەمـەندە و دێ ژنێکی سـۆزانیی بەگەڵ خـۆی داوە و داوای ژوورێک دەکـا بۆ مـاوەی تەنیـا بیسـت دەقیـقـەیەک! جـارێک ئێـرانیـیـەکیش هات، ژنێکی سـۆزانیـی عـارەبی لـەگەڵ بـوو؛ دەتگوت ماسییە.

محەمەدی حاجی زادە لە تەلەفۆن، بەدەم پێکەنینەوە دەیگوت:

«من وا تێ دەگەیشتم کە تەنیا لە ئێران زەواجی سیغە هـەیە.

بەینی خـۆمان بێ، هـەمـوو جـارێک سـێ سـەد و پەنجـا فـرەنکەکە وەردەگـرم و

ڕێک دەیخەمە باخەڵی خۆمەوە. بەینی خۆمان بێ، فەرهاد! بەڵام، یەکسەر، دوای تەواوبوونی ئەوان، واتە دوای هاتنە دەرەوەیان، دەچم بەپەلە ناونوێنەکە ڕێک دەخەمەوە و حەمامەکەش پاک پاک دەشۆم. بەڵام جاری واش هەیە ئەسڵەن، سەگبابانە، خۆشیان بسمیل ناکەن و حەمامەکە پاک پاک جێ دەهێڵن.

ئەگەر تۆ هەر لە سانت مالۆ بمێنیتەوە، من لێرە لە ماوەی ساڵێکدا بۆ خۆم دەبمە ملیۆنێر».

ئنجا بە حەنەکەوە دەیگوت:

– فەرهاد گیان؛ جارێ وا زوو مەیەوە!

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

– هەموو جارێک، سێ سەد و پەنجا فرەنکەکە ڕێک و ڕەوان دەخەمە باخەڵی خۆمەوە. بەینی خۆمان بێ!

محەمەدی حاجی زادە هەموو جارێک پێی دەگوتم «بەینی خۆمان بێ». منیش هەرگیز ئەم نهێنییەم لەلای مسیۆ لووسیانا نەدرکاندبوو.

بیرم دەکردەوە دەمگوت «تۆ بڵێی مسیۆ لووسیانا لەناو سیستەمی تەلەفۆنی هوتێلەکەیدا دەنگی محەمەدی حاجی زادەی تۆمارکردبێت و بەم نهێنییەی زانیبێت و.. منی بەم هۆیەوە لەپێش چاو کەوتبێت؟ گومانی خستبێتە سەر منیش؟»

خۆم پێ ڕانەگیرا، گوتم: خۆ هیچ ڕووی نەداوە؟

– نا.

بەم نیگەرانییەوە مامەوە تا گەیشتینە ناو ڕێستورانتە خۆش و شکۆمەندەکەی لێ زامباسادۆر Les Ambassadeurs لە مەیدانی کۆنکۆرد.

– تۆ حەزت لە شەرابی مارتینییە، دەزانم.

بە گارسۆنەکەی گوت:

– بۆ منیش شەرابی سووری بۆردۆ.

گارسۆنەکان، دیار بوو خزمەتی پیاوماقووڵێکی ئەوتۆ دەکەن کە ئەو پیاوماقووڵەیان دەناسی و دەیان جاری دیکە لە خزمەتیدا بوونە. چونکە چەند قاپێکی مەزەی جۆراوجۆری بەتامی ئەوتۆیان لەسەر مێزەکەمان دانا بێ ئەوەی مسیۆ لووسیانا هیچی هێشتا داوا کردبێ.

– ئەم مەزە جۆراوجۆرانەی دایاندەنێن، من زۆر حەزم لێیانە.

لە گۆشەیەک دانیشتبووین کە دەنگی مۆسیقایەکی خۆش بەهێمنی ڕۆحمی دەلەراندەوە. بۆنی پرتەقاڵم دەکرد، بۆنی گەنمەشامیی برژاویش لەسەر مێزەکەمان. تامی شەرابی مارتینییەکەم زۆر پێ خۆش بوو.

– تۆ زۆر حەزت لە ڕەنگی سوورە.. فەرهاد!

تەماشای کراسە سوورەکەمی دەکرد:

– خۆزگە منیش وەک تۆ هونەرمەند بوومایە!

گوتم: تۆ لە هونەرمەندێک زیاتر زەوق و مەعریفە و هەست و نەستی جوانت هەیە.

مسیۆ لووسیانا گوتی:

– هونەرمەند جیهان بەشێوەیەکی تازەی ئەوتۆ، وەک چۆن خۆی دەیەوێ، دەتوانێ دروست بکاتەوە. چێژیش لەم دروستکردنەوە وەهەمییە وەردەگرێت؛ بۆیە هونەرمەند هیچ کاتێک باکی بەو واقیعە بۆگەن و کوشندەیە نییە. واقیع ئەگەر ناهەموار بێ یان خۆش.

– وایە.

– بەڵام ئێمەی مرۆڤی ئاسایی.. دەوڵەمەند و ئەکادیمی و مێژوونووس و تۆژەر و خاوەن هوتێلە لووکسەکان.. ناچارین ژیان وەک هەیە قبووڵ بکەین، بە هەموو شەڕ و خراپە و ناشیرینییەکانی خۆیەوە؛ چاویشمان هەمیشە لەوەیە کە تەنیا خۆشبەختی و جوانی و خۆشگوزەرانییەکان، بە هەر نرخێک

بێ، ڕاو بکەین. ئەمەیە جیاوازیی نێوان ئێمەومانان و ئێوەی هونەرمەند. من بۆیە هەمیشە ئێرەیی بە هونەرمەند دەبەم. ئێوەی هونەرمەند زۆر بەختەوەرن، لە هەموو کائینێکی تری سەر ئەم زەوییە بەختەوەرترن.

من بیرم لەم فەلسەفە لەناکاوە دەکردەوە. ئەو درێژەی بە قسەکانی دا:

- بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە سەروەت و سامان و پارە دەستەوەستان ماونەتەوە و هیچیان لە توانادا نییە بۆ مرۆڤایەتی ئەنجامی بدەن.

من دەمزانی مسیۆ لووسیانا دەیویست قسەیەکی تر بکا، چاوەڕێی بووم. پاش کەمێک بیرکردنەوە، گوتی:

- فەرهاد.. گوێ بگرە.. من بڕیارم داوە سێ چارەگی ئەو سەروەت و سامان و میراتەی بۆم بەجێ ماوە، لە داهاتوودا بیخەمە چەند پڕۆژەیەکی خزمەتکردنی مرۆڤایەتییەوە.

مسیۆ لووسیانا خاوەن سێ هوتێلی لووکس بوو- هەر یەکەیان لە پایەتەختێکی جیاوازی دنیا. هوتێلێکی سێ ئەستێرەیی لووکس لە پاریس، دووەمم لە ئۆکسفۆرد، سێیەمیشیان لە تەلئەبیب. ئەمە جگە لە، وەک خۆی دەیگوت: چەند ئاپارتمانێک لە پاریس، سێ ئاپارتمان لە ئۆکسفۆرد، چوار ئاپارتمانی دیکە لە تەلئەبیب، دووازدە دەرمانخانەش لە دووازدە شاری جۆراوجۆری فەڕەنسا...

مسیۆ لووسیانا گوتی:

- من جگە لە ئاپارتمان و هوتێل و دەرمانخانەکانمان، پارەیەکی نزیکەی سێ ئەوەندەی ئەم هەموو موڵک و میراتەشمان لە چەند بانکێکی سویسرادا پاراستووە. دایکم وەسیەتی کردبوو، خۆیشم هەر زۆر زۆر قەناعەتم پێی هەیە؛ بەشێکی فراوانی، بخەمە خزمەتکردنی پڕۆژە خزمەتگوزارییەکانی مرۆڤایەتییەوە. دەمەوێ بە هانای ئەو هەموو کۆست وماڵوێرانی و بەدبەختییانە بکەوم کە لەم جیهانە گەورەیەدا بەسەر برسی و لێقەوماوەکاندا هاتووە.

مسیۆ لووسیانا هەر دوو دەستی خۆی لە شێوەی تۆپێکی گەورەدا، خڕ، ڕاگرت و گوتی:

– لەبەرئەوەی من واتێ دەگەم، جیهان عەینەن وەک تۆپێکی گەورەی خڕ، لە هەر شوێنێکی دنیادا ئەگەر کونێکی تێ بکەوێت و بریندار ببێ، لەئەنجامدا ئەو تۆپە خڕە وردە وردە فش دەبێتەوە و دەپووکێتەوە.. واتە لە کۆتاییدا ئەو تۆپە خڕە گەورەیە بەهۆی یەک کونی بریندارەوە زیان بە شوێنەکانی دیکەشی دەگات.

مسیۆ لووسیانا گوتی:

– لافاوێک ئەگەر لە هایتی هەڵبستێت و هەزاران خەڵک و خانووبەرە ببنە قوربانی، یان بوومەلەرزەیەک ئەگەر لە سریلانکا ڕووبدات و سەدان کەس و بینا و خانوو بەهۆیەوە لەناو بچن، ئەم جۆرە کارەساتانە وەک ئەوە وان کە لە هەمان کاتدا بەسەر شارێکی کۆلۆمبیاشدا هاتبن، یان لە ئوستراڵیاش دڵی خەڵکیان توند کردبێ! جیهان عەینەن ئەو تۆپە گەورەیە، ماڵی هەموومانە.. ئێمە لە هەر کوێیەک بین فەرق ناکا.

ئەم قسانەی مسیۆ لووسیانا بۆ من زۆر گرینگ و تازە بوون، بەوپەڕی وردبینییەوە گوێم لە خۆشەویستی و پەیامی پێغەمبەرانەی ئەو پیاوە ڕاگرتبوو.

– ئەگەر کونێک بکەوێتە هەر جێگەیەکی ئەم گۆی زەوییە خڕەوە، جێگەیەکی تریش لەو سەری دنیاوە یان تەنانەت چەندین جێگەی دیکەش بەهۆی ئەو کونەوە زەرەرمەند دەبن.

مسیۆ لووسیانا قسەی دەکرد و من گوێم لێی ڕاگرتبوو.

– ئێمەی مرۆڤ بەرپرسی تەنیا ئەو شوێنە نین کە تێیدا دەژین، بەڵکو پێویستە خۆمان بە لێپرسراوی هەموو کونج و گۆشەیەکی ئەم جیهانە بزانین کە پەروەردەگاری مەزن وەک نیعمەتێک بە ئێمەی بەخشیوە.

ئنجا گوتی:

– ئێمە لەسەرمان پێویستە جیهان بپارێزین. لە هەر شوێنێکی ئەم گۆی زەوییە برینێک هەبێ، تیماری بکەین.

من بەدرێژاییی ژیانم هیچ سیاسەتوانێک، هیچ پێغەمبەرێک، هیچ هونەرمەندێکم نەدەناسی بەم شێوەیەی مسیۆ لووسیانا بیر بکاتەوە.. بەم شێوەیەی مسیۆ لووسیانا، موڵک و میرات و سامانی تایبەتی خۆی، هێند خۆبەخش و بەخشندانە، بخاتە خزمەتکردنی مرۆڤایەتییەوە.

مسیۆ لووسیانا درێژەی دا:

– خودان تەعالا بەشێکی زۆر موڵک و میرات و سامانی بەخشیوەتە من، منیش دەبێ ئەو خەڵکە ستەمدیدە و لێقەوماوانەی سەرزەمینم لەبیر بێت کە کەوتوونەتە بەر زەبروزەنگی خوانەناس و دکتاتۆرەکانەوە، یان کە بەردەوام دەکەونە بەر هەڕەشەی سروشت و بوومەلەرزە و تیرۆریست و لافاوەکانەوە.

مسیۆ لووسیانا ئنجا گوتی:

– بۆ ئەم مەبەستە، من پێوەندیم بە دەیان ڕێکخراوی ناحکوومییەوە کردووە، پێوەندیم بە چەندین کۆمەڵە و فۆنداسیۆنی باربووکردنی مرۆڤایەتییەوە کردووە.. ئەوانەی بۆ یارمەتیدانی لێقەوماوەکانی دنیا کاردەکەن.. ئەوانەی بە هانای زیان لێکەوتووەکانی شەڕەکانەوە دەچن.. ئەوانەی لەپێناو ژن و منداڵە ئاوارەکان کاردەکەن، جلوبەرگ و خۆراکیان بۆ دەنێرن، بەتایبەتی ئەو کۆمەڵە و فۆنداسیۆن و ڕێکخراوانەی روویان لە ولاتانی ئاسیا و ئەفریقا و ئەوروپای ڕۆئاوایە.

من لە ڕاپەڕین و کۆڕەوەکەی بەهاری ساڵی ١٩٩١ بەملاوە، ئاگام لێ بوو چەندین ڕێکخراوی ناحکوومی لە هەموو ولاتانی ئەوروپاوە ڕوویان کردبووە کوردستانی عیراق بۆ باربووکردنی خەڵکی ئاوارەی ئەوێ و یارمەتیدانی زیانلێکەوتووەکانی جەنگ و ئەنفال و دروستکردنەوەی شارۆچکە داڕووخاوەکانی ئەوێ، بەتایبەتیش بۆ هەڵەبجە.

مسیۆ لووسیانا پێی گوتم:

– ئنجا دەمەوێ یارمەتیم بدەی، بۆ ئەوەی وڵاتەکەی تۆش لەم یارمەتیدانەی من بێبەش نەبن.

لەگەڵ مسیۆ لووسیانا ڕێک کەوتین کە ناونیشانی چەند ڕێکخراوێکی ناحکوومیی بۆ بدۆزمەوە بۆ ئەوەی پێوەندییان پێوە بکات بۆ ئەم مەبەستە هاوکاریی یەکتر بکەن.

ئنجا دووای تەواوکردنی قسەکردن لەبارەی ئەم مەسەلەیە، لێم پرسی:

– تەنیا بۆ ئەم مەسەلەیە منت بانگ کردە پاریس؟

مسیۆ لووسیانا لێمی پرسی:

– ماندووی؟

گوتم: نا.

گوتی: پێ دەچی نەختێک ماندووی سەفەر بی.

گوتم: حەزدەکەم بزانم ئاخۆ بڕیاری چیت داوە؟

– لەبارەی چی؟

گوتم: لەسەر پشتی پۆستکارتێکدا نووسیبووت کە دەتەوێ بەیەکجاری بچیت بۆ تەلئەبیب و هەرگیز نەگەڕێیتەوە پاریس. لە پۆستکارتێکی دیکەشدا نووسیبووت کە لە زانکۆی تەلئەبیبەوە لە بەشی ڕۆهەڵاتناسی، داوایان لێ کردووی کە بچیت لەوێ وانە بڵێیتەوە. لە نامەیەکیشدا نووسیبووت کە لەوانەیە بچیت بۆ ئۆرشەلیم. کەی دەچی بۆ هیندستان؟

مسیۆ لووسیانا زەردەخەنەیەک کەوتە سەر لێوی. لێم پرسی:

– هەر وا بە سەفەر دەچی بۆ هیندستان؟

مسیۆ لووسیانا گوتی:

– ڕاستییەکەی؛ دەمەوێ ڕای تۆ وەربگرم.

– لەبارەی چی؟

مسیۆ لووسیانا پێش ئەوەی دەست بە قسەکردن لەبارەی (دەردەدڵەکەی) بکات، دیار بوو دەیویست بە پێشەکییەک دەست پێ بکا؛ گوتی:

– من نەمدەتوانی هەندێ قسە هەن بە تەلەفۆن لەگەڵت باسیان بکەم.

گوتم: بەڵێ.

وەک ئەوەی هەواڵێکم پێ ڕابگەیەنێ کە من هەرگیز ئاگاشم لێی نەبێ. گوتی:

– من و محەمەدی حاجی زادە زۆر زۆر لەیەکتر دەچین. دەزانی!

گوتم: وایە.

مسیۆ لووسیانا گوتی:

– دەمەوێ بچم بۆ ئێران.

یەکسەر ئەوەم بیر هاتەوە (تەنانەت مسیۆ لووسیانا خۆیشی پێی گوتبووم) کە ئەو، جگە لەوەی جوولەکەیە، چەندین جار چووەتە ئیسرائیل و دەیان ڤیزەی ئیسرائیل بە پەساپۆرتەکەیەوە هەیە؛ ئەمەش مەترسیی ئەوەی لەسەر دروست دەکات کە کۆماری ئیسلامیی ئێران هەر لە یەکەم دەقیقەی گەیشتنی بۆ ناو فڕۆکەخانەی تاران بیگرن و وەک جاسووسێکی ئیسرائیل و وەک ئەنتی ئیسلام مامەڵەی لەگەڵ بکەن:

– خەتەرە.

– دەزانم.

– ئەمە ڕیسکە.

گوتی: گوێ بگرە!

گوتم: بەڵێ.

گوتی:

– ئەگەر داوا لە محەمەدی حاجی زادە بکەم بۆ ماوەی مانگێک

پەساپۆرتەکەی خۆیم بداتێ بۆ ئەوەی سەفەرێکی ئێرانی پێ بکەم؛ تۆ بڵێی بمداتێ؟

مسیۆ لووسیانا دەستی خستە ناو باخەڵی چاکەتەکەی، پەساپۆرتەکەی خۆی و کۆپیی پەساپۆرتەکەی محەمەدی حاجی زادەی لەناو باخەڵی خۆی دەرهێنا و پیشانی دام:

– تۆ باش لە وێنەی هەردووکمان ورد بەرەوە؛ بزانە چەند لەیەکتر دەچین!

منیش دوای ئەوەی زۆر ڕاگوزارییانە لە وێنەی سەر پەساپۆرتی هەردووکیان وردبوومەوە، هەر دوو پەساپۆرتەکەم دایەوە دەستی:

– پێویستیم بە وردبوونەوە لێتان نییە، من هەر لە یەکەمین ڕۆژەوە باش باش دەمزانی کە ئێوە تا چ ڕادەیەکی زۆر لەیەکتری دەچن. ئەی من هەمیشە پێم نەدەگوتی؟!

– هەر زۆر زۆر لەیەکتر دەچین!

لە مسیۆ لووسیانام پرسی:

– محەمەدی حاجی زادە خۆی ئەم پێشنیازەی بۆت کرد؟

مسیۆ لووسیانا گوتی:

– نەخێر، نا. تۆ خۆت دەزانی، من ساڵانێکی یەکجار زۆرە هەر خۆم دەمەوێ سەردانێکی ئەسفەهان بکەم و بچم (زیبا)ش ببینمەوە. ئەمە گەورەترین خەون و تاقە ئاواتی هەموو ژیانی من بووە.

ئنجا دوای بیرکردنەوەیەکی خێرا، گوتی:

– نەخێر. من خۆم بیرم لێی کردووەتەوە. هات بە خەیاڵما. نا. محەمەدی حاجی زادە پیاوێکی باشە. دەزانی!

ئنجا گوتی:

– کاتێ دەگەمە فرۆکەخانەی تاران، بە ئێرانییەکان دەڵێم «چووبوومە پاریس کارێک بدۆزمەوە و پێی بژیم، ئێستا گەڕاومەتەوە وڵاتی خۆم و دەمەوێ

ئێــوه چۆنی بــەباش دەزانــن ئاوهــا بژیم». خــۆ هــەزاران ئێــرانــی هــەن دەچــنە دەرەوەی وڵاتی خۆیان بۆ کارکردن و پاشان دەگەڕێنەوە.

بە مسیۆ لووسیانام گوت:

– محەمەدی حاجی زادە لە تاران کاتی خۆی خەلعی لیباس کراوە.

– بۆمی باس کرد. کاتێ لێم پرسی «ئاخۆ دەتوانێ دوای ئەم خەلعی لیباسە جارێکی دیکە بگەڕێیتەوە تاران»، گوتی «ئا». بێگومان دەتوانێ بگەڕێتەوە. محەمەدی حاجی زادە باسی ئەوەشی بۆ کردم کە چۆن کاتی خۆی کچێکی ئازەریی لەناو کـەمـپـێکی پەناهەندانی شـارێکی تورکـیـا کـردووەتە ژن و منداڵێکیشی لێی هەیە.. بەڵام من کارم بەسەر ئەم شتانەوە چییە؟ تەنیا چەند هەفتەیەک لەوێ دەمێنمەوە.

گوتم: پرسیارێکی تر.

– بەڵێ.

– تۆ لای ئەو باسی زیبا و ئەو دەسنووسـانەی باپیرە گـەورەکـانی خـۆتت کردووە کە لە ئێران لەبارەی جوولەکەوە هەن؟

– نەخێر، هەرگیز.

ئنجا گوتی:

– هەر بۆ زانیــاریشت، من ئێـســتــا هەر زۆر کـەم دەچم بۆ هوتێلەکـە. بەڕێوەبەرێکی گشتی و ژمێریارێکم لەوێ تەعین کردووە.. ئەوان هەر هەموو کارەکان دەکەن. دەزانی! نەخێر، نا؛ ئەم نهێنی و باس و خـواسـانەی ژیانی من، تەنیا تۆ دەیانزانیت.. فەرهاد.

ئنجا لێم پرسی:

– تۆ لە محەمەدی حاجی زادەت داواکردووە پەساپۆرتەکەی خۆتت بداتێ؟

– ئەمە لە تۆ دەپرسم. پێی بڵێم. داوای لێ بکەم بە ڕای تۆ؟ دەیدا؟

من تێدا مابووم، نەمدەزانی چی بڵێم؟ خەریک بوو پێی بڵێم «من بەرامبەر

بەم پرسیارە بەرپرس مەکە و پێوەندیم بەم مەسەلەیەوە نییە و خۆت بڕیار بدە!». کەچی لەلایەکی تریشەوە هەستم دەکرد مسیۆ لووسیانا تەنیا خاوەنی ئەو هوتێلە نییە کە من دووای مانگێکی دیکە دەگەڕێمەوە ئەوێ و تێیدا دەست بە کار دەبمەوە؛ بەڵکو هاوڕێیەکمە، تەنانەت هاوڕێیەکی زۆر بەوەفا . من بەقەدەر باوکم مسیۆ لووسیانام خۆش دەویست.

– محەمەدی حاجی زادە باشترین دەرفەتە بۆ من کە بتوانم بەهۆی پەساپۆرتەکەی ئەوەوە سەردانێکی کورتی ئێران بکەم!

من، بێدەنگ، بیرم دەکردەوە. ئەو گوتی:

– ئەگەر بۆ تەنیا یەک ڕۆژیش بێ حەزدەکەم زیبا ببینمەوە. پاشانیش، وەک بۆم باس کردیت، ئەو هەموو دەسنووسە بەهادارانەی کنێشتەکەی باپیرە گەورەم لە ئەسفەهان!

مسیۆ لووسیانا درێژەی بە قسەکانی دا:

– ئەم سەفەرەم بۆ ئێران ناسنامەی ڕەسەنایەتیی خۆم و قەومەکەم بۆ من دەگەڕێنێتەوە. دەزانی! زۆر حەزدەکەم بچم.

لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئەگەر لووسیانا ئەم سەفەرە بکات، ئەوا بۆ خۆی زیبای دۆستە دێرینەکەی خۆی دەدۆزێتەوە و لەوانەیە بەیەکتر شاد ببنەوە. بەڵکو شتێکی گرینگ لە ژیانی هەردووکیاندا ڕوودەدات و بەختەوەر دەبن! پاشان ئەمە سالانێکی یەکجار زۆرە کە مسیۆ لووسیانا خەون بە بینینی ئەسفەهان و کارکردن لەسەر بەڵگەنامەکانی باپیرەگەورەکەیەوە دەبینێ. بڵێم چی؟

گوتم:

– ئارەزووی خۆتە.

پاشان یەکسەر گوتم:

– بەڵام بە ڕای من، جارێ سەبرێک بگرە و وا زوو داوای لێ مەکە!

مسیۆ لووسیانا گوتی:

– بەڵام من زۆر لەمێژە دەمەوێ داوای لێ بکەم. ئەسڵەن هەر لە هەفتەی یەکەمەوە ئەم بیرۆکەیە هات بە خەیاڵما.

ئنجا گوتی:

– زۆر حەزدەکەم بچم!

مسیۆ لووسیانا مژێکی پڕ لە چێژی لە جگەرەکەی دا و تەماشای بنمیچی درەوشاوەی ناو ڕێستورانتەکەی دەکرد: خەونی دەبینی...

دەسنووسە بەهادارەکانی باپیرەگەورەکەی لە ئەسفەهان، مەزاری حافزی شیرازی، بەتایبەتیش – لە هەموویان گرینگتر بۆ ئەو: زیبا.. زیبای هەمیشە زیندووی ناو خەونەکانی!

### شەشەمین پۆستکارت

فەرهادی ئازیز، گلەییت لێ دەکەم هاتبوویتە پاریس و نەهاتبووی سەرێک لە من بدەی. دەزانم تەنیا بۆ یەک شەو لای مسیۆ لووسیانا مابوویتەوە، بەڵام هەر دەبووایە هیچ نەبێ قاوەیەک لەگەڵ منیش بخۆیتەوە و ئێمەش پێکەوە دوو قسەمان بکردایە.

فەرهاد گیان،

من بڕیارم داوە لەم ڕۆژانەدا بەیەکجاری دەگەڕێمەوە ئێران و خۆم دەدەمەوە دەستی کۆماری ئیسلامیی ئێران. من دڵنیام لەمە (حەزدەکەم تۆش دڵنیا بیت) کە هیچم لێ ناکەن و ناشمگرن، چونکە لەوێ پێیان دەڵێم کە لە فەرەنسا کارم دەکرد و ئێستا گەڕاومەتەوە وڵاتی خۆم. هەزاران خەڵکی ئێرانیی بەدبەختی وەک من هەن کە دووای مانەوەی چەندین ساڵ لە دوورەوڵاتیدا بێکار، دەگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان.

ڕاستییەکەی، ماندوو بووم لەدەست ئەوەی کە هەمیشە و تا هەتایە هەر بێ پەساپۆرت و بێ ناسنامە لەم جیهانەدا سەرگەردان، هەر بسووڕێمەوە.

بەتایبەتیش کە تۆ لەم ڕۆژانەدا دێیتەوە و دەست بە کاری خۆت دەکەیتەوە و من دیسان بێکار دەمێنمەوە.

کەی دێیتەوە پاریس و دەست بە کاری خۆت دەکەیتەوە لە هوتێلەکە؟

ئاگادارم بکەوە!

وەرەوە پاریس . مسیۆ لووسیانا چاوڕێتە.

چاوەکانت ماچ دەکەم.

محەمەدی حاجی زادە – ١٩٩٤/٩/٢٥

## حەوتەمین پۆستکارت

فەرهاد گیان،

کە تۆ ئەم پۆستکارتەت بە دەست دەگات، من لەوانەیە لە تاران بم، چونکە وا ئێستا لە فرۆکەخانەی شارڵ دیگۆلەوە ئەم پۆستکارتەت بۆ دەنێرم. ئیتر دووای ئەمە، پاش چەند سەعاتێکی تر من چیتر لە فەرەنسا نامێنم. بۆ وەدەستهێنانی (ناسنامە) دەبێ تەنیا بگەڕێینەوە وڵاتی خۆمان. مرۆڤ لە دوورەوڵاتیدا، بەتایبەتی لە ئەوروپا، هیچ ناسنامەیەکی نییە و قەتیش نابێ. مرۆڤ تەنیا لە وڵاتی خۆیدا و لەناو قەومی خۆیدا بەها و مانایەکی هەیە.

فەرهادی ئازیز،

سوپاس بۆ تەلەفۆنەکەت کە پێرێ شەو بۆت کردم، بەڵام من تازە تەواو؛ بڕیارم داوە بەیەکجاری دەگەڕێمەوە وڵاتی خۆم.

لە تەلەفۆن پێت گوتم کە تۆ خۆشت بەتەمای بگەڕێیتەوە کوردستان. کەواتە لەوە دەچێ چارەنووسمان نزیک بێ لە یەکتر، بەڵام بەداخەوەم کە نەمانتوانی بۆ دووا جار یەکتر ببینینەوە. ئایا هەر لە سانت مالۆوە بلیتی گەڕانەوە دەبڕیت بەرەو کوردستان؟

هەر چۆنێک بێ، ئەگەر هاتیتەوە پاریس و دەستت بە کاری خۆت کردەوە لە هوتێلەکە؛ مسیۆ لووسیانا چاوەڕێتە.

سوپاس بۆ هەموو شتێکی بۆت کردم،

خوا ئاگادارت، تا هەتایە.

محەمەدی حاجی زادە – ١٩٩٤/٩/٢٩

– هەموو نیگارکێشەکانی پێش سەردەمی (بەهزاد) ئەگەر بیانویستایە بۆ نموونە وێنەی تەنیایی (فەرهادی کۆکەن) ڕەسم بکەن، دەچوون فەرهادیان لەناو بیابانێکدا وێنەدەکێشا؛ بەڵام بەهزاد هات تەنیایی فەرهادی لەناو ئاپۆرەی ژیانی سەردەمدا، لەناو وەزیر و ئاسنگەر و ڕاوچی و باخچەوانە سەرقاڵەکاندا، واتە لەناوجەرگەی شار و هاتوچۆی خەڵکدا ڕەسمی تەنیایی فەرهادی کرد و.. تەنیاییەکەیشی زۆر جوان دیار بوو.

ساقی گوڵچین گوتی:

– ئەمەیە داهێنانی بەهزاد لەچاو ستایلی میناتۆریستەکانی پێش خۆی.

لەگەڵ ساقی گوڵچین بەراوردی شێوازی کۆن و شێوازی مۆدێرنمان دەکرد لە بەستێنی شێوەکاریدا.

لەناو ستۆدیۆکەمدا، ساقی گوڵچین بەدیار یەکێک لە تابلۆکانی منەوە کە زۆری پێ جوان بوو، درێژەی بە قسەکانی دا و پەنجەی بۆ هەمان تابلۆکەم درێژکرد:

– ئەم تابلۆیەت بەتەواوەتی ئەم هونەرەی بەهزادی تێدایە کە تازە باسم کرد. تۆ لەم تابلۆیەدا، زۆر جوان تەنیاییی خۆت و نۆستالجیای خۆتت بۆ زێد و کەسوکاری خۆت دەربڕیوە، بێ ئەوەی دەربڕینی ئەو ئەتمۆسفێرە جەنجاڵەی ئەورووپاش لەبیر بکەی کە سروشتی تازەی جیهانی ئەمڕۆی مۆدێرنە. تۆ وێنەی نۆستالجیای خۆتت بۆ وڵاتەکەت بەشێوەیەکی زۆر مۆدێرن کێشاوە.

ساقی گوڵچین هێشتا هەر لە تابلۆکەم ڕامابوو، گوتی:

– تۆ لەم تابلۆیەتدا ڕەنگە گەرمەکانی ڕۆژهەڵاتت زۆر بەکارهێناوە. پێ

دەچێ لە سانت مالۆ زۆر غەریبیی وڵاتی خۆت بکەی؟

ڕاستی دەکرد، ماوەیەکی زۆر بوو لە سانت مالۆ غەریبیی هەولێرم دەکرد، تەنانەت دامنابوو هەر بەیەکجاری بشگەڕێمەوە، گوتم:

– وایە.

ساقی گوڵچین، تابلۆکەی هەڵگرت و خستیە ڕیزی حەوت تابلۆکەی تری پاڵ دیوارەکە، کە جیای کردبوونەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆی بیانباتە گەلەرییەکەی خۆی:

– ئەمە بووە هەشتەمین تابلۆ.

من و ساقی گوڵچین چەندین مانگ بوو یەکترمان نەدیبوو. پێش ئەوەی بێتە لام بۆ سانت مالۆ، تەلەفۆنێکی بۆ کردبووم؛ یەکەمین قسەی – دوای چاک و چۆنی – ئەوە بوو بەدڵخۆشییەوە پێی ڕاگەیاندم کە شووی بە پیاوێکی مەغریبی کردووە.

– فەرهاد.. سووپرایزێک!

گوتم: چییە؟

گوتی: لە سانت مالۆین.

– بەڕاست؟

– ئا.. لەگەڵ هاوسەرەکەم.

– کەواتە، گەیشتن! بەخێر بێن! لە کوێن لە سانت مالۆ؟

– لە هوتێل (لا مادلێن). دەمێکی دیکە دێم سەرێکت لێ دەدەم. ناونیشانەکەتم لایە. لەماڵەوەی؟

گوتم: لە ماڵەوەم. بەخێر بێی!

ساقی و مێردەکەی، پێکەوە هاتبوونە سانت مالۆ بۆ ئەوەی هەفتەیەک لەم دورگە تووریستییە جوانەی سانت مالۆ بمێننەوە و لە هەمان کاتیشدا ساقی گوڵچین چەند تابلۆیەکی تازەش لەو تابلۆیانەی کە لە سانت مالۆ دروستم

کردبوون لە من بکرێت و لەگەڵ خۆی بیانباتەوە بۆ گەلەرییەکەی خۆی لە سان فرانسیسکۆ. ساقی گوڵچین گوتی:

– هاوسەرەکەم دەمێکی دیکە دێتە باڕی ( ئێرلەندییەکان) و لەوێ چاوەڕێمان دەکا. دوێنێ ئێوارەش لەوێ پێکەوە دانیشتبووین، هەر لەژێر هوتێلەکەمانە. زۆر نزیکە. بچین پێکەوە هاوسەرەکەشم بناسیت؟

– بۆ نا؟ حەزدەکەم.

لەگەڵ ساقی گوڵچین ڕاهاتبووین بە زمانی فارسی قسەمان لەگەڵ یەکتر دەکرد. تەماشای چاوە پڕ شەراب و مەکرەکانی ساقیم دەکرد، بۆنی قاوەی سووتاوم لە لەشی دەکرد؛ بەڵام ساقی مێردی کردبوو. نەمویست هیچ بێ حورمەتییەک بکەم و باسی ئەو پێوەندییەی ڕابردووی خۆمانی لەگەڵ تازە بکەمەوە. گوتم:

– لەگەڵ مێردەکەت بە چ زمانێک قسە بکەم؟

گوتی: تۆ عارەبی دەزانی! بەڕاست دەشتوانن بە فەرەنسی قسە بکەن.

بە خوێندنەوەی نیگا گەرمەکانی من، ساقی هەستی کرد کە حەزم دەکرد ماچێکی لاگەردەنی بکەم. زەردەخەنەیەکی کرد و تەماشای عەرزەکەی کرد. گوتم:

– لەوانەیە ئەم کۆمەڵە تابلۆیە ئاخرین تابلۆی من بێ پێتی بدەم.

ساقی گوڵچین بە حەپەسانەوە گوتی:

– بۆ..؟

گوتم: دامناوە بەیەکجاری بگەڕێمەوە بۆ کوردستان.

گوتی: بۆ عیراق؟

– بەڵێ.

گوتی: ئەی سەدام هێشتا هەر لەوێ نییە؟

گوتم: نا. باکوری عیراق ئازادە. چیتر دەستی سەدامی ناگاتێ. جگە

لەمەش، من یازدە ساڵ زیاترە کەسوکاری خۆمم نەدیوە. غەریبییان دەکەم. لەوانەیە لەم هەفتەیەی داهاتوودا بگەڕێمەوە.

مێردەکەی لە هوتێل بەجێ هێشتبوو و چاوەڕێی ئێمەی دەکرد تا بچین لە باڕی ئێرلەندییەکان یەکتر ببینن. ساقی گوڵچین، دووای ئەوەی جەختیی لەسەر ئەم قسەیەی پێشوو کردەوە، گوتی کە مێردەکەی خاوەن کۆمپانیایەکی بەرهەمهێنانی فیلمی سینەماییە و لە هوتێلەکە سۆزی لەگەڵ دەرهێنەرێکی (کەتەلان) و خاوەن کۆمپانیایەکی فەرەنسی هەیە و پاشان دێتە لامان بۆ باڕی ئێرلەندییەکان. گوتم: «کەواتە با بڕۆین؟».

– شۆستەیەکی بەر هەتاوی خۆشە. دەچین لەوێ بیرەیەک دەخۆینەوە.

– با بڕۆین.

– دوو سبەی لەگەڵ هاوسەرەکەم دێینەوە لات و ئەو هەشت تابلۆیە، ئەو کات دەگوازمەوە.

خەریک بوو دەرگای ستۆدیۆکەم کلۆم دەدا. بۆ نیشاندانی خۆشەویستییەکی برادەرانە، ساقی گوتی:

– کەواتە بەتەمای بگەڕێیتەوە وڵاتی خۆت؟

– وابزانم.

کلیلی ژوورەکەم خستە باخەڵم، ساقی بە ئاوازێکی مخابنەوە یانیش لەوە دەچوو بۆ ئەوەی دڵی من بداتەوە، لەبەرخۆیەوە گوتی:

– ئەورووپا بۆ هەموومان تەنیا وەک هوتێلێکە.

دەنگی قاچەکانی ساقی گوڵچین بەسەر تەختەی ناو ئاپارتمانەکەمدا زۆر خۆش لەناو دڵمدا دەزرنگایەوە. چاوەڕێی ئەوەم دەکرد قۆڵ بخاتە قۆڵمەوە، نەیکرد.

لەو دەمەوەی لە پێپلکەکانەوە دابەزاینە خوارەوە تا گەیشتینە بەردەم باڕی ئێرلەندییەکان، ساقی گوڵچین بەردەوام باسی تابلۆکانی من و گەلەرییەکەی

خۆی دەکرد لە سان فرانسیسکۆ، هەروەها ئەو هەموو تابلۆیەی ئەو هەموو نیگارکێشە یۆنانی و چینی و کووبایی و هیندی و رۆهەڵاتییانەی کە لە گەلەرییەکەی خۆیدا بەردەوام بە رەواجێکی زۆرەوە دەفرۆشرێن.

ئنجا کاتێ گەیشتینە بەردەم شۆستە بەرهەتاوەکەی باری ئێرلەندییەکان کە لەوێ داوای بیرەیەکی تووبۆرگ و پلسنمان کرد، هاتە سەر باسی مورتەزای برای و گوتی کە وەزعی زۆر باشە و ئێستا بووەتە بەرێوەبەری گەلەرییەکەی خۆی لە سان فرانسیسکۆ؛ پاشانیش باسی محەمەدی حاجی زادەی کرد و گوتی کە جار بە جار پۆستکارتێک بۆ یەکتر دەنێرن، ئنجا گوتی کە محەمەدی حاجی زادە، مانگ و نیوێک پێش ئەمرۆ، لەسەر پشتی پۆستکارتێکدا بۆی نووسیوە کە ئێستا لە پاریس خۆی فێری زمانی پورتوگالی کردووە. ئنجا بە محەمەدی حاجی زادە پێ کەنی. زۆر پێ کەنی، بەتایبەتیش بەوە زۆر پێ کەنی کە چۆن رۆژێک محەمەدی حاجی زادە کاتێ تازە گەیشتبووە پاریس چووبوو لەناو سووپەرمارکێتێکدا قوتوویەکی گەورەی خواردنی پشیلەی بۆ خۆی کرییوو؛ وایزانیبوو مرەبایە و خواردبووشی.

ساقی گوڵچین کە لە پێکەنینە درێژخایەنەکەی بووەوە، گوتی:

– لەم ماوەیەدا دوو پۆستکارتم بە هەمان ناونیشانی هوتێلەکە بۆی ناردووە، کەچی هیچ وەڵامێکی نەداومەتەوە.

بە ساقی گوڵچینم نەگوت کە محەمەدی حاجی زادە گەراوەتەوە ئێران بۆیە وەڵامی نییە، چونکە هێشتا بەتەواوەتی من خۆیشم دڵنیا نەبووم لەو راستییە. بەڵام لەو دەمەدا من یەکسەر ئەو ژنە ئێرانییە سەڵتەنەتخوازەی شاری (گرۆنۆبڵ)م بیرکەوتەوە، دەستەخوشکی ساقی گوڵچین، رۆئیا خانم، ئەو بێوەژنە ئێرانییەی کە (ساقی گوڵچین) محەمەدی حاجی زادەی ناردبووە لای بۆ ئەوەی فاڵ و قاوەی بۆ بگرێتەوە.. بۆئەوەی ئەو پیاوە مەغریبییەی لەپێش چاو بکەوێت کە دەیگوت ناوی موبارەکە و چاوی بڕیبووە موڵک و میراتەکەی رۆئیا خانم و دەیویست لەپێناو ئەو ئامانجەدا بیخوازێت؛ کە چۆن پاشانیش ئەو رۆئیا خانمە بەستەزمانە بە سەکتەی قەلبی کۆچی دوایی کردبوو!

ساقی گوڵچین بەلەز پەرداخی بیرەکەی دانایەوە سەر مێزەکە:

– ئەمە هاوسەرەکەمە، هات.

هاوسەرەکەی، کە ساقی گوڵچین دەیگوت عەرەبێکی مەغریبییە و فەرەنسیش دەزانێ، لەژێر چەترێکی شۆستەی بارەکەدا، لەبەردەم هەردووکماندا قووت بووەوە.. سڵاوێکی لێمان کرد و دانیشت. ئنجا لەناو کورسییەکەیدا عەینەکە ڕەشەکەی لەچاو کردەوە و دەستی تەوقەی بۆ درێژکردم و بە فەرەنسی پێی گوتم:

– خۆشاڵم بە ناسینت.

پیاوێکی ئەسمەری تابڵێی کەشخە و قۆز! هەستم کرد من ئەو پیاوەم پێشتر دیوە، بەتایبەتیش چونکە تەماشام کرد خاڵێکی گۆشتن (کە زیاتر لە زیادەگۆشتێک دەچوو وەک لە خاڵ) لەسەر ڕوومەتی چەپی هەبوو. ئەمە شتێکی بیر دەخستمەوە نەمدەزانی چییە؟

ئەو پیاوە ئەسمەرە قۆزە مەغریبییە زەردەخەنەیەکی کرد و خۆی پێشکەش کردم:

– موبارەک!

ساقی گوڵچین بە زەردەخەنەیەکەوە کەوتە نێوانمان:

– موبارەک جگە لە عەرەبی، فەرەنسیش دەزانێ.

من ویستم لە ناوی ئەو پیاوە مەغریبییەی هاوسەری ساقی دڵنیا ببمەوە، وام نیشان دا کە باش گوێم لە ناوی نەبووە، گوتم: ببوورە؟

هاوسەرەکەی ساقی گوڵچین، خاڵێکی گۆشتن (کە زیاتر لە زیادەگۆشتێک دەچوو وەک لە خاڵ) لەسەر ڕوومەتی چەپی، بە فەرەنسییەکی پێرفێکت، دووبارە ناوی خۆی پێ گوتمەوە:

– موبارەک!

ساقی گوڵچین بە زەردەخەنەیەکی پڕ لە مەکرەوە گوتی:

– هەمووی چەند مانگێکە چووینەتە ناو قەفەسی زێڕینەوە.

## دڵتوندی و نیگەرانییەکی گەورە

لە سانت مالۆ دوو جاری دیکەش ساقی گوڵچینم دیت و پێکەوە لەگەڵ یەکتر دانیشتین. جاری یەکەم لە هەمان باڕی ئێرلەندییەکان، جاری دووەمیش لە قاوەخانەیەکی قەراغ دەریا بە ناوی La Java – لە نزیک ئەو شوێنەی کە من پۆرترێتم بۆ تووریستەکان دروست دەکرد.

دڵم زۆر توند بوو. بەردەوام لەو ماوەیەدا، لە سانت مالۆ، دڵم زۆر توند بوو. لە سانت مالۆ بە ساقی گوڵچینم نەگوت کە ئێستا محەمەدی حاجی زادە خۆی کردووەتە مسیۆ لووسیانای خاوەن هوتێلەکەم و لە جێگەکەی ئەو دانیشتووە و وەک مسیۆ لووسیانا ڕەفتار دەکا! نەخێر. پێم نەگوت کە هەفتەی ڕابردوو وەختێ چوومەتەوە پاریس بۆ ئەوەی دەست بە کارکردن بکەمەوە لە هوتێلەکەم، محەمەدی حاجی زادە چۆن خۆی لە من کردووە بە مسیۆ لووسیانا و چۆنیش باسی محەمەدی حاجی زادەی وا دەکرد کە گوایە محەمەدی حاجی زادە بەیەکجاری گەڕاوەتەوە بۆ ئێران و هیچ هەواڵێکی نازانێ!

هیچ شتێکم لەبارەی محەمەدی حاجی زادەوە بە ساقی گوڵچین نەگوت؛ چونکە هێشتاش هەر لە سەدا سەد لە هەموو شتەکان دڵنیا نەبووبووم. لەلایەکی دیکەشەوە دەترسام ڕێککەوتنێک لەنێوان محەمەدی حاجی زادە و مسیۆ لووسیانادا هەبووبێت و من ئاگام لێ نەبێ. هەر چۆنێک بێ، تووشی هەستێکی شپرزەیی و بێهوودەییی زۆر ناخۆش هاتبووم.

ئەمە جگە لەوەی کە لە ماوەی ئەم هەفتەیەدا جارێکیان ئەرشەدی قازی لە پاریسەوە تەلەفۆنێکی بۆ کردم و سڵاوی هاوڕێ کوردە نیگارکێشەکانی

پاریسمی پێ ڕاگەیاند و لەکۆتاییدا بە تانە و گازاندەوە گوتی:

– پێم نەدەگوتی کە مەلا جاسووسە!

ئەم قسەیەی دوو جاران لەناو گوێچکەمدا دووپات کردەوە:

– پێم نەدەگوتی کە مەلا، عەمامە بەسەرەکانی کۆماری ئیسلامیی ئێران بۆ ئێرەیان ناردووە! تۆ باوەڕت پێ نەدەکردم.

ئەرشەدی قازی دەیگوت:

– یانیش ئەوەتا... پیاوێک، کە هێندە شانازیی بە ئیسلام و ئێرانیبوونی خۆشیەوە بکا؛ چۆن دێ لەپێناو (پەساپۆرتێک) واز لە دین و نیشتیمان و هەوییەتی خۆی دەهێنێ؟!

دڵم زۆر توند بوو. بەردەوام لەو ماوەیەدا، لە سانت مالۆ، دڵم زۆر توند بوو. نەشمدەزانی چی بکەم؟

مسیۆ لووسیانا دووای ئەو شەوەی کە لە ڕێستورانتی لێ زەمباسادۆر Les Ambassadeurs لە پاریس لەگەڵ یەکتر دانیشتین و ویستی ڕای من لەبارەی ئەو سەفەرەی خۆی بەرەو ئێران وەربگرێ، دووای چەند ڕۆژێک لەگەڵ محەمەدی حاجی زادە ڕێک کەوتبوون لەسەر ئەوەی کە بۆ ماوەی تەنیا مانگێک پەساپۆرتەکانی خۆیان لەگەڵ یەکتر بگۆڕنەوە، بۆ ئەوەی مسیۆ لووسیانا بتوانێت سەفەرێکی کورت بۆ ئێران بکات.

مسیۆ لووسیانا خۆی ئەم قسانەی، بە تەلەفۆن، بە دەنگی خۆی، لە فڕۆکەخانەی شارڵ دیگۆلی پاریسەوە بۆ من گێڕایەوە.. پێش ئەوەی خواحافیزشیم لێ بکات، گوتی:

– دڵم نەهات دیسان داوات لێ بکەم لە سانت مالۆوە بگەڕێیتەوە پاریس بۆ ئەوەی خواحافیزیت لێ بکەم و لە فڕۆکەخانەوە بەڕێم بکەی!

محەمەدی حاجی زادە پەساپۆرت و ناسنامە و هەندێکی تریش لە بەڵگەنامەکانی مسیۆ لووسیانای – بۆ حاڵەتی پێویستی ئاسایش – لە مسیۆ

لووسیانا وەرگرتبوو، بەرامبەر بەمەش ڕەگەزنامە ئێرانی و پەساپۆرتە ئێرانی و هەندێکی تریش لە بەڵگەنامە ئێرانییەکانی دیکەی خۆی – بۆ حاڵەتی پێویستی ئاسایش لە ئێران – دابووە دەست مسیۆ لووسیانا؛ هەر خۆیشی تا فرۆکەخانەی شارڵ دیگۆل لەگەڵی چووبوو و بەڕێی کردبوو بەرەو تاران!

مسیۆ لووسیانا خۆی، ئەم قسانەی، بە تەلەفۆن، بە دەنگی خۆی لە فرۆکەخانەی شارڵ دیگۆلی پاریسەوە بۆ من گێڕایەوە.. پێش ئەوەی خواحافیزیشم لێ بکا، گوتی:

– دوعام بۆ بکە بەڵکو بتوانم (زیبا) ببینمەوە و بتوانم بەڵگەنامە بەهادارەکانی باپیرەگەورەکەم لە ئەسفەهان بدۆزمەوە!

لە دڵی خۆمدا دەمگوت، هەر بۆ سبەینەکەی، محەمەدی حاجی زادە حەتمەن چووە پێوەندیی بە سەفارەتخانەی ئێرانەوە کردووە لە پاریس؛ موخبیریی داوە کە پیاوێکی فەرەنسی بە ناوی لووسیانا دو توودێل De Tu-dele بەئەسڵ جوولەکەی پورتوگاڵ، کە لە پاریس جاسووسی بۆ دەوڵەتی ئیسرائیل دەکات و چەندین جار هاتوچۆی ئیسرائیلیشی کردووە.. ڕۆژی سێشەم سەعات حەوت و نیوی بەیانی دەگاتە فرۆکەخانەی تاران و .. بیگرن؛ چونکە پەساپۆرتێکی ساختەی ئێرانیی بەناوی محەمەدی حاجی زادەوە لەگەڵ خۆی هەڵگرتووە!

لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «تۆ بڵێی وای کردبێ؟!». «لەدەستی دێ». بەڵام ئەگەر وای کردبێ، بۆ خۆیشی لێرە زیانمەند دەبێت. چونکە پۆلیسی فەرەنسی ئەگەر بەمە بزانن دێن دەیگرن!

خۆ لەوانەشە محەمەدی حاجی زادە لەم ماوەیەدا (لەم ماوەیەی کە مسیۆ لووسیانا لە پاریس نەماوە و چووەتە ئێران) چووبێت بەشێکی موڵک و میرات و سامانەکەی مسیۆ لووسیانای لە بانک ڕاکێشابێت و... هیچ دوور نییە کە...!؟

هەندێک جاریش دەمگوت: هیچ دووریش نییە محەمەدی حاجی زادە لەگەڵ

مسیۆ لووسیانا پێکەوە بەشێوەیەک ڕێککەوتنێکی نهێنی و تایبەتیان لەگەڵ یەکتر کردبێت و من پێ نەزانم! لەو کاتەشدا من پێویست ناکا بە هیچ شێوەیەک خۆم هەڵبقورتێنمە نێوانیانەوە. چاکتریش وایە لەو حاڵەتەدا، بۆ بەرژەوەندیی هەردووکیان، من هیچ کارێکم بەسەریانەوە نەبێ! بەڵێ. بێدەنگ بم باشترە.

بەڵام ئەگەر ڕێککەوتنێکی وا لەنێوانیاندا هەبووایە، مسیۆ لووسیانا چۆن بە منی نەدەگوت؟!

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا بە خۆمم دەگوت: «بەڵام هیچ مەرج نییە کە مسیۆ لووسیانا بە پێویستی زانیبێ لەم مەسەلەیە ئاگاداری من بکاتەوە».

دڵم زۆر توند بوو. بەردەوام لەو ماوەیەدا، لە سانت مالۆ، دڵم زۆر توند؛ هەمووده‌م بیرم لە مسیۆ لووسیانا دەکردەوە و نەشمدەزانی چی بکەم؟

مسیۆ لووسیانا بۆچی لە ئێرانەوە، ئەوا سێزدە ڕۆژ زیاترە هیچ تەلەفۆنێکی بۆ نەکردم؟

بۆچی ئەوا سێزدە ڕۆژ زیاترە هیچ پۆستکارتێکی لە تارانەوە یان لە ئەسفەهانەوە بۆ من نەنارد؟

لەو ڕۆژەوەی کە مسیۆ لووسیانا چووە بۆ ئێران، هەر کاتێک بە تەلەفۆن ئەم پرسیارانە لە محەمەدی حاجی زادەی ساختەکار و درۆزن دەکەم، خۆی لێم دەکاتە مسیۆ لووسیانا و عەینەن ئیبلیسێک خۆی وا پیشان دەدا کە ئەو پیاوەی ئێستا لە پاریس لە (هوتێل ئەوروپا) دادەنیشێت و خاوەنی هوتێلی ئەوروپایە و قسەم لەگەڵ دەکا، ئەوا مسیۆ لووسیانا خۆیەتی. لە هەموویشی ناخۆشتر ئەوەیە کە ئەو ئیبلیسە، پێم دەڵێ:

– ئەم قسەیەی خۆت جوانترین بەڵگەیە کە بە من باوەڕ بکەیت، باشترین بەڵگەیە بۆئەوەی باوەڕ بکەیت کە مسیۆ لووسیانا منم. ئەمەتام من لە پاریس.. وەرە بمبینە!

محەمەدی حاجی زادە خۆی کردبووە مسیۆ لووسیانا و دەیگوت:

– من به هیچ شێوەیەک نەچوومەتە ئێران و لێرەم. بەڵکو ئەوە محەمەدی حاجی زادە بووە کە گەڕاوەتەوە بۆ ئێران.

محەمەدی حاجی زادە دەیگوت:

– محەمەدی حاجی زادە بە منیشی گوت کە دەگەڕێتەوە تاران و خۆی ڕادەستی کۆماری ئیسلامیی ئێران دەکاتەوە و هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆ فەرەنسا.

محەمەدی حاجی زادە، بە فەرەنسییەکی پێرفێکت، لەودیو دەسکی تەلەفۆنەکەوە پێی دەگوتم:

– محەمەدی حاجی زادە بەیەکجاری گەڕایەوە بۆ ئێران. جارێکی دیکە نایەتەوە فەرەنسا، باوەڕ ناکەم. چونکە وای بە من گوت و ڕۆیشت. ئەم هوتێلەی بەجێ هێشت و تا هەتایە فەرەنساشی بەجێ هێشت.

محەمەدی حاجی زادە، عەینەن ئیبلیسێک، بە فەرەنسییەکی پێرفێکت (چونکە من باش باش ئەکسانتی محەمەدی حاجی زادە دەناسمەوە و دەزانم کە ئەو دەنگەی قسەم بۆ دەکا بە هیچ شێوەیەک دەنگی مسیۆ لووسیانا نییە)، لەودیو دەسکی تەلەفۆنەکەوە هەمیشە داوای ئەوەشم لێ دەکات کە بگەڕێمەوە پاریس و بچم لەسەر کارەکەی خۆم لە هوتێل دەست بە دەوامی خۆم بکەمەوە!

محەمەدی حاجی زادە هیچ دووریش نییە هەرگیز هیچ پێوەندییەکی بە سەفارەتخانەی ئێران لە پاریسەوە نەکردبێ، بەڵکو پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە فڕۆکەخانەی تارانەوە کردبێ.. یان ڕاستەوخۆ پێوەندیی بە دەزگای ئیتیلاعاتی کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە کردبێ لە تاران:

– پیاوێکی فەرەنسی، بە ناوی لووسیانا دو توودێل De Tudele بەئەسڵ جوولەکەی پورتوگاڵ، کە لە پاریس جاسووسی بۆ دەوڵەتی ئیسرائیل دەکات....

خۆ لەوانەیشە، ئەسڵەن هیچ پێوەندییەکی بە هیچ دەزگایەکی کۆماری ئیسلامیی ئێرانیشەوە نەکردبێت، بەڵکو لە تاران خودی دەزگای ئیتیلاعاتی

کۆماری ئیسلام، هەر خۆیان گومانیان کەوتبێتە سەر و گرتبێتیان. هەر جوولەکەیەک بچێتە ئێران، ڕزگاری نابێ.. بێگومان.

داخ و ئەفسووس!

ئەو شەوەی لەگەڵ مسیۆ لووسیانا لە ڕێستورانتی (لێ زەمباسادۆر Les Ambassadeurs ) دانیشتین، هەرگیز چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد کە مسیۆ لووسیانا بە جیدیی بێت و هێندە بەپەلە بڕیار بدا. لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «عەشقی زیبا ئەمەی پێ کرد».

محەمەدی حاجی زادە، هەمیشە کاتێ تەلەفۆنم بۆی دەکرد بۆ پاریس و دەمویست شتێکی تازەم گوێ لێ ببێت یان هەواڵێکی مسیۆ لووسیانا بزانم؛ هەمیشە، دیسانەوە، خۆی لێم دەکردەوە بە مسیۆ لووسیانا و دەیگوت:

– محەمەدی حاجی زادە بەیەکجاری گەڕایەوە بۆ ئێران.. فەرهاد!

دەیگوت:

– من لووسیانام، لووسیانای هاوڕێی خۆت.. وەرەوە پاریس دەوامی خۆت بکە!

من دڵم زۆر توند بوو.

بەردەوام لەو ماوەیەدا، لە سانت مالۆ، دڵم زۆر توند بوو.

دەمزانی ئەگەر بچمەوە پاریس و لە هوتێلەکە سەر لە محەمەدی حاجی زادە بدەم؛ ئەوا دیسان، وەک جاری پێشوو لە تەلەفۆنەکاندا، خۆی لێم دەکاتەوە بە مسیۆ لووسیانا و پێم دەڵێ:

– ئەوە محەمەدی حاجی زادە بووە کە گەڕاوەتەوە بۆ ئێران. وەرە دانیشە دەوامەکەی خۆت بکە لە هوتێلەکەت.. من لووسیانام.

## گەڕانەوە بۆ کوردستان

من دەبووایە بگەڕێمەوە بۆ وڵاتەکەی خۆم.

تەنیا یەک جانتای گەورەم پێ بوو لە سانت مالۆ بۆ گەڕانەوە بەرەو پاریس و لەوێشەوە بۆ هەولێر.

بلیتێکی پاریس – ئەستەمبۆڵ- دیاربەکرم بڕیبوو بۆ ڕۆژی (٢٤/١٠/ ١٩٩٤)، لە دیاربەکریشەوە دەبووایە بە ئوتومبێل بەرەو هەولێر بەڕێ بکەوم.

لەسەر ڕێگەی خۆم لە پاریس، گوتم با ئەم جارەش سەرێکی هوتێلەکە بدەمەوە و بزانم لە هەواڵی مسیۆ لووسیانا چ خەبەر، مسیۆ لووسیانای سەرهەڵگرتووی ئەویندار و بێ سەروشوێن!

چاوەڕێی هیچ ئەنجامێکی باش نەبووم؛ بەڵام هەر چووم.

وەک جاری پێشوو، محەمەدی حاجی زادە، دیسان، خۆی لێم کردەوە بە مسیۆ لووسیانا و پێی گوتم:

«ئەوە محەمەدی حاجی زادە بووە کە گەڕاوەتەوە بۆ ئێران. وەرە دانیشە دەوامەکەی خۆت بکە!».

محەمەدی حاجی زادە جلوبەرگێکی بە هەمان ستایلی مسیۆ لووسیاناشی کردبووە بەر؛ دەیگوت:

– محەمەدی حاجی زادە بە منیشی گوت کە دەچێ خۆی دەداتەوە دەستی کۆماری ئیسلامیی ئێران.

محەمەدی حاجی زادە، بە فەرەنسییەکی پێرفێکت، پێی دەگوتم:

– محەمەدی حاجی زادە ناسنامەی ڕاستەقینەی خۆی دۆزییەوە، تازە.

جارێکی دیکە چاوت پێی ناکەوێتەوە. هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆ فەڕەنسا.

محەمەدی حاجی زادە کاتێ باسی (ناسنامەی ڕاستەقینەی خۆی) کرد، بە هیچ شێوەیەک نەیتوانی وشەی (ناسنامە) بەتەواوەتی وەک حونجەکردنی مسیۆ لووسیانا حونجە بکات.

کۆتایی

خوێنەری خۆشەویست،

سەرجەم ڕووداوەکانی ئەم ڕۆمانە بەسەرهاتی ڕاستەقینەن و کەسەکان تا ئێستاش لە ژیاندان، بەڵام پێویستە ئاماژە بەمە بدەم کە - لەبەر باری ئاسایش و ژیانی کەسەکان - ناوی زۆربەی پاڵەوانەکان و هەندێ لە شوێنەکانم لەم گێڕانەوەیەدا گۆڕیوە.

زۆر بەداخەوەم بۆ چارەنووس و ژیانی مسیۆ لووسیانای ئەویندار، لووسیانای هاوڕێم، کە عەشقی (زیبا)، عەشقی بێ سنووری (زیبا) لە ئێران هەڵی لووشی و.. تاکو ئێستا بە هیچ شێوەیەک هیچ سەروشوێنێکی دیار نییە.. لەو ڕۆژەشەوە هیچ هەواڵێکی نازانم.

منیش، کە لە ساڵی ١٩٩٤ بەملاوە بەیەکجاری گەڕامەوە بۆ کوردستان و تاکو ئەمڕۆش هەر لە هەولێر دەژیم، هەر وەختێک -جار بە جار - کاتێ سەرێکی پاریس دەدەمەوە و بە بەردەم هوتێلی (ئەورووپا)دا تێپەڕ دەبم، کاتێ دەبینم مسیۆ لووسیانا هێشتا هەر لە ئێران، بێ هەواڵ و بێ سەروشوێنە؛ خەریکە دڵم شەق دەبا...

هەولێر: ٢٠١٠/٣/٧